# نەوژین

ژمارە (٤) چوارشەممە ٢٠١٧/٣/٨

مانگنامەیەکی تایبەتە بە پرسەکانی ژنان، رادیۆی دەنگ بە پاڵپشتی سندوقی نیشتمانی بۆ دیموکراسی NED ئەمریکی لەگەرمیان دەریدەکات




کچانی گەرمیان دەگەڕێنەوە سەر تەختەی شانۆ

7 »»

# «هێنانی ژنی دوەم لە گەرمیان لە هەمو شتێک ئاسانترە»

▪ نەوژین

**پارێزەرێک ئاشکرای دەکات ئەو یاساو رێکارانەی کە بۆ رێگەنەدان بە فرەژنی لەئارادان، کەموکورتیی و کێشەیان تێدایە، ئەمەش وایکردوە هێنانی ژنی دوەم ببێتە کارێکی زۆر ئاسان.**

نەشاد عومەر، پارێزەر لە گەرمیان، لەمیانەی وتارێکدا کە تایبەت بۆ (نەوژین)ی نوسیوە، دەڵێت: «پرۆسەی فرەژنی و هێنانی ژنی دوەم ئەگەر لە هەرێم رێژەکەی زیادی کردبێت، ئەوا لە ناوچەی گەرمیاندا پرۆسەکە بوە بە دیاردەیەکی زۆر بەربڵاو و ئاشکرا».

دەشڵێت: «رەنگە لەناوچەکانی دیکە ئەنجامدانی گرێبەستی هێنانی ژنی دوەم و زیاتریش هەندێک زەحمەت بێت بۆ پیاوان، بەڵام لەگەرمیان لەهەمو شتێک ئاسانترە و هیچ زەحمەتێکی تێدا نییە».

بەپێی ئامارێکی بەڕێوەبەرایەتی بەرەنگاربونەوەی توندوتیژیی خێزانیی لەگەرمیان، رێژەی حاڵەتەکانی هێنانی ژنی دوەم لەساڵی رابردودا بەرێژەی ٢٪ زیادیکردوە.

بەوتەی عەقید (لەمیعە محەمەد)، بەڕێوەبەری بەڕێوەبەرایەتی بەرەنگاربونەوەی توندوتیژیی خێزانیی لەگەرمیان کە بۆ (نەوژین) قسەی کردوە، هاتنی ئاوارەکان بۆ دەڤەرەکە رێژەی فرەژنی زیادکردوە، بەو هۆیەی خێزانە ئاوارەکان فرەژنی تائێستاش حاڵەتێکی ئاساییە لەلایان و رێگەی پێدەدەن.

ئەو پارێزەرە ئاماژەی بەوەکردوە کە پیاوان بۆ هێنانی ژنی دوەم رو لە دادگاکانی ناوچە دابڕێنراوەکان دەکەن کە سەر بە حکومەتی عێراقین و لە گەرمیانەوە نزیکن، لەوێ بە ئاسانی ژنی دوەم و زیاتر مارە دەبڕن، بەبێ ئەوەی لە یاساکەی هەرێمی کوردستان باسێکی لەم مەسەلە کردبێت.

وتیشی: «یاساکەی هەرێم مەرجداری کردوە کەپیاو لەکاتی ئەنجامدانی فرەژنی تەنها هاوسەرەکەی دەتوانێت سکاڵای لەسەر بکات، ئەم کارەش هێندەی تر بەدواداچونی یاسایی دژ بەو پیاوانە قورس کردوە.»

لە لاپەڕە (٩) وتارەکەی پارێزەر (نەشاد عومەر) دەخوێنیتەوە.




# قۆناغەکانی 8ی مارس

▪ نەوژین

**٨ی مارس وەکو کورتکراوەی رۆژی جیهانی ژنان دەستنیشانکراوە، لەم بەروارە ژنان لەسەرانسەری جیهان ئاهەنگ دەگێڕن و باس لەو دەستکەوتانە دەکەن کە لەروە جیاوازەکانی ژیان بەدەستیان هێناوە. لێرەدا پێنج قۆناغی مێژویی و گرنگی ئەم رۆژە دەخەینە رو.**

بۆیەکەمجار و بەفەرمیی، ئەم رۆژە وەکو بۆنەیەکی تایبەتی ژنان دەستنیشانکرا، ئەویش کاتێک لە کۆنگرەی یەکەمی یەکێتی ژنانی دیموکراتی جیهانی لە پاریس لە ساڵی ١٩٤٥ بڕیار لەوە درا ئەو بەروارە وەکو رۆژێکی تایبەت بە ژنان بناسرێت.

دیارییکردنی ئەم رۆژە، رەگێکی مێژویی دورتری هەیەو پەیوەندی هەیە بەو بزوتنەوە نارەزایەتیەی کە پێش سەدەی بیست ژنانی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا دەستیان پێکرد.

ئەم رۆژە رەگەکەی لە ئەمریکایەو دواتر لەگەڵ پەرەسەندنی خەباتی بزوتنەوەکانی ژنان، بۆ هەمو ناوچەکانی گۆی زەوی دەکشێت.

لەساڵی ١٨٥٦ بەهەزاران ژن رژانە سەر شەقامەکانی شاری (نیویۆرک)ی ئەمریکا، بۆدەربڕینی نارەزایەتییان لەبارەی بارودۆخی خراپی ژیانیان و بەتایبەت ئیشکردنیان، بەوەی ناچار دەکران بە کارکردنی زۆر و قورس، ئەمەش بەرپرسانی ناچار کرد چاوێک بەو مەسەلەیەدا بخشێننەوە.

دواتر و لەساڵی ١٩٠٨، بەهەزاران ژنی کارکەر لە کارگەکانی رستن دا جارێکی دیکە هاتنە سەر شەقام، بەڵام ئەمجارەیان نانێک و چەپکێک گوڵیان هەڵگرتبو و هەر بەم بۆنەیەشەوە ناوی بزوتنەوەکەیان نا «نان و گوڵ».

خۆپیشاندانەکەی ئەم بزوتنەوەیە داوای کەمکردنەوەی کاتژمێرەکانی کارکردن و قەدەغەکردنی ئیشپێکردنی منداڵان و دەستبەرکردنی مافی ژنانی دەکرد.

هەروەک یەکێکی تر لە داوا سەرەکیەکانیان ئەوەبو کە ژنان هاوتای پیاوان مافی بەشدارییان هەبێت لە هەڵبژاردنە گشتییەکان دا و بتوانن دەنگ بدەن.

ئەم بزوتنەوەیە بوە دەستپێکی بزوتنەوەیەکی بەرفراوانتر و کاریگەرتری ژنان بەتایبەت کە ژنانێکی زۆر لە چینی ناوەند هاتنە پاڵ بزوتنەوەکەو پێکەوە داوای دەستبەرکردنی مافە سیاسی و مەدەنیەکانیان و یەکسانییان دەکرد.

ئیتر دوای ئەو ساڵە ئەو رۆژە لەلای ژنانی ئەمریکا وەکو رۆژێک بۆ جەختکردنەوە لە مافەکانی ژنان ناسراو هەمو ساڵێک لەو بەروارەدا خۆپیشاندان و رێپێوانی جەماوەریی ژنان بەڕێوە دەچو.

بەڵام پەسەندکردنی ئەم رۆژە وەکو بۆنەیەکی جیهانی بەشێوەیەکی فەرمیی، دواکەوت هەتا ساڵی ١٩٧٧، کە تیایدا نەتەوەیەکگرتوەکان داوای لە وڵاتانی ئەندامی کرد بەوەی رۆژێک دیاریی بکەن لەساڵدا وەکو رۆژی ژنان، زۆرینەی وڵاتان ٨ی مارسیان دەستنیشان کرد.

هەربۆیە بەکۆی دەنگی وڵاتانی ئەندام لەو ساڵەدا ٨ی مارس لەلایەن نەتەوەیەکگرتوەکانەوە بە رۆژی جیهانی ژنان دەستنیشان و پەسەند کرا، هەربۆیە زۆربەی وڵاتان ئەو رۆژەیان وەکو بۆنەیەکی فەرمی بۆ ژنان دان پێدا ناوە.



کچانی کاکەیی .. قوربانیی بیروباوەڕی ئاینیی و پلەبەندیی کۆمەڵایەتیین

3 »»



دو هاوسەری پێشمەرگە

6 »»



منداڵانی سەر زبڵدانەکان

8 »»

# بۆ وازهێنان لەمارەیی ڤیدیۆی هاوسەرەکانیان دەگرن و هەڕەشەی بڵاوکردنەوەی دەکەن

■ نەوژین، گوڵباخ حەسەن

**ئەوەی کە هەرگیز (چیمەن) بیری لێنەکردبویەوە، ئەوەبوە کە ڕۆژێک لەلایەن هاوسەرەکەیەوە کە هاوبەشی ژیان و باوکی منداڵەکانێتی، لەکاتی سەرجێیکردندا بەدزیەوە کامێرا دابنێت و وێنەی بگرێت، لەوەش شۆک تر ئەوەیە کە هەڕەشەی بڵاوکردنەوەی ڤیدیۆکان بکات ئەگەر ئەم بە داواکانی رازیی نەبێت.**

ئەو کـە ژنێکی تەمەن (٣٠) سـاڵە، پـاش زنجیرەیـەک کێشـەو شـەڕی خێزانی، پیاوەکەی داوای جیابونەوەی لێدەکات، بـەڵام نایەوێت مارەییەکەی بدات، هەربۆیـە پەنا بـۆ وێنەگرتنی دەبات و هەڕەشەی بڵاوکردنەوەی وێنەو ڤیدیۆکانیـش دەکات ئەگەر ئەم داوای مارەیی بکات.

لەسـەرەتادا کە گوێبیسـتی چیرۆکی (چیمەن) بوم، توشی سەرسوڕمان بوم و پێموابو حاڵەتێکی تاک و بارودۆخێکی شـاز و تایبەتە، بەڵام کە بەدواداچونی زیاتـرم کرد، ئەوەم بـۆ رونبویەوە کە ژمارەیەکـی زۆرتر لە ژنـان روبەروی هەمان بارودۆخ کراونەتەوە.

ئەو ژنانە باسلەوەدەکەن کە بەهۆکاری دەسـتبەرداربون بەبێ هیچ بەرامبەر و مارەییەک، پیاوەکانیان پەنایان بۆ ئەم کارە قێزەونە بردوە.

(چیمـەن) کە ناوی ئـەو و هەمو ئەو ژنانـەی دیکە کە وەکـو قوربانی لەم راپۆرتـەدا هاتـون خوازراون، باسـی لەوەکـرد دوای چونـەوەی بـۆ ماڵی باوکی مێردەکـەی رازیدەکات بۆئەوەی بگەڕێتەوە لای، بەڵام دوای سـێ شەو دیسـان لەماڵ دەری کردووەو ئەمجارە پێیوتوە کە گرتەی ڤیدیۆیی لێ گرتوە و هەڕەشـەی بڵاوکردنـەوەی دەکات ئەگر بیەوێت داوای مافی جیابونەوەی بکات.

ئەو ژنە ئاماژەی بەوەکرد کە بەناچاریی و بۆ پاراسـتنی نـاو و ئابڕوی خۆی و خێزانەکەی، بۆیە رازیی بوە بە مەرجی هاوسـەرەکەی و دەسـتی لەهەمـوو مافەکانی هەڵگرتوە.

چیمـەن، دواین قوربانـی ئەمجۆرە لە تەڵەکەبازیی نیە، بەڵکو چەندین کەسی هاوشێوەی هەن کە هەمویان بەمشێوەیە لەترسـی کۆمەڵـگاو ئابڕوچونیـان دەستیان لەمافەکانی خۆیان هەڵگرتەوە و بە جیابونەوە رازیی بون.

سەوسەن، یەکێکی دیکەیە لە قوربانیانی ئـەم حاڵەتـە. ئـەو چیرۆکـی خۆی بەمشێوەیە بۆ (نەوژین) دەگێڕێتەوە: «بەهـۆێ ئەوەی منالّم نەبو مێردەکەم بـەردەوام هەڕەشـەی جیابونـەوەی لێدەکردم، ماوەیەک لەگەڵم زۆر باش بو بەشێوەیەک هەرگیز ئەو هەڵسوکەوتەم لـێ نەبینی بو، چەنـد جارێک لەکاتی سـەرجێیکردن دا داوای وێنەگرتـن و گرتەی ڤیدیۆیی لێکردم، منیش هەرگیز بیرم بەلای ئەوە دا نەچو کە مێردەکەم بۆ مەرامی خراپ بەکاری بهێنێت، بۆیە رازیی بـوم بەداواکـەی، کەچی دواتر زانیم بۆ مەبەستی دیکە وێنەو ڤیدیۆی گرتوم».

وتیشی: «هاوسـەرەکەم لەپڕ لەگەڵم گۆڕاو ناچـاری کردم رازیبم بەوەی ژنم بەسـەردا بهێنێت و منیش رازیی بوم، هەر دوای رازیی بونیشـم هەڕەشـەی بڵاوکردنەوەی ڤیدیۆکانی لێکردم ئەگەر داوای جیابونـەوە نەکـەم، منیش بە ناچاری و لەترسی کێشەی کۆمەڵایەتی بـێ دەنگیـم هەڵبـژارد و لەبەرامبەر سڕینەوەی گرتە ڤیدیۆییەکان لەهەموو مافە یاساییەکانم خۆش بوم».

وتیشـی: «دواجـار بـۆم دەرکەوت مێردەکەم رێگەی بۆ دانراوە و بۆ ئەوەی من بێبەشـبم لە موڵک و سامانەکەی، ئەو کارەی لەگەڵکردووم».

ئەو ژنانەی ئـەم کارەیان لەبەرامبەردا کـراوە، لەپێنـاو ئـەوەی لەلایەنـی مەعنەوییەوە تێکنەشـکێن و ناوبانگی خێزانەکانیـان خراپ نەبێـت، چونەتە ژێرباری خواسـت و داوای مێردەکانیان بەجیابونـەوە بەبێ هیـچ بەرامبەر و مافێـک. بەڵام ژنانێکـی دیکەش هەن کە جیـاواز لەو دو حاڵەتەی پێشـو، مامەڵەیان لەگەڵ ئەم حاڵەتەدا کردوە.

نەسـرین، بە پێچەوانـەی (چیمەن) و (سەوسەن)ەوە توانیویەتی بەهاوکاری دادگا لـەو داوە رزگاری بێـت کـە مێردەکەی بۆی ناوەتەوە.

ئـەو بـۆ (نەوژیـن) باسـیلەوەکرد دوای ئـەوەی تـۆراوە لەماڵـی باوکی بـوە لەرێگـەی ژمارەیەکـەوە ئاگادار کراوەتەوە کە گرتـەی ڤیدیۆیی هەیەو بۆ بڵاونەکردنەوەی داوای بڕە پارەیەکی لێکـراوە، بـەڵام دوای لێکۆڵێنـەوە دەردەکەوێت کـە مێردەکەی خۆی بوە کەتەلەفۆنی کردوەو ئەو سـیناریۆیەی دانـاوە، بۆیـە ئەویش سـکاڵای لەدژ تۆمارکـردوەو سـزای تاوانەکەی خۆی وەرگرتوە.

بەڵام هەمو کات ژنـان ناتوانن ئەوەی نەسرین کردویەتی، ئەوانیش پێیهەستن، چونکە زۆرێکیان پێیان باشترە بێبەش بن لە مافە مادیەکانیان، بەڵام ناوبانگی خۆیـان و خێزانەکانیـان لەدەسـت نەدەن.

بەوتەی چالاکوانێکی بواری ژنان، هەمو کات ژنانـی قوربانی لەبیـری ئەوەدان لەروی مەعنەویی و کەرامەتەوە پارێزراو بـن، هـەر ئەمەشـە وادەکات زۆرجار ناهەقی و زوڵمیان بەرامبەر بکرێت یان قبوڵی بکەن.

ڤیان سابر، سەرپەرشتیاری پرۆژەکانی رێکخـراوی خەڵـک بۆ گەشـەپێدان لەگەرمیان کەلەبواری ژنان دا چالاکن، ئاماژە بەوەدەکات کە زۆرحاڵەت هاتوەتە بەردەستیان کە ئەگەر ژنەکان سکاڵایان تۆماربکردایە، پیاوەکان روبەروی سـزا دەبونـەوە، بەڵام لەترسـی «زڕاندنی ئابـڕو و ناوبانگیـان»، بێدەنگییـان هەڵبژاردوە.

وتیشـی: «مـرۆڤ زۆرجـار سـەری دەسوڕێت لەبەرامبەر قێزەونی رەفتاری هەندێـک لەپیاوان، کە بـۆ پێنەدانی مافێکی مادیی هاوسەرەکانیان، بیر لە شـێواز و رێگای وەها خراپ و چەپەڵ دەکەنەوە، کە مرۆڤ بەبیستنی توشی شۆک دەبێت».

ئەو چالاکوانـە، وتیشـی: «هەندێک لەپیـاوان بـاس لەوەدەکـەن کـە هاوسەرەکانیان شەرەف و ناموسیانن، ئەمە چ جـۆرە وەهمێکە کە ژن کاروە بە شـەرەف و کەرامەتی پیاو، کاتێک پیاوانێک هەبن ئامادەبن تا ئەو رادەیە بڕۆن کە مشتێ پارەیان لە بڵاوکردنەوەی وێنـەی روتی هاوسـەرەکانیان بەلاوە گرنگتر بێت؟!»

ئارەزوە یان ناچاریی یاخود چاولێکەریی؟

# نیقاب روخساری هەندێک لە ئافرەتانی گەرمیان دادەپۆشێت

■ نەوژین، ژینۆ عەلی

**(کوێستان) زۆرکات کە بەلای دوکان و فرۆشگاکانی کەمالیات و جوانکاریی ژنان دا تێدەپەڕێت، لەدڵەوە ئارەزوی پۆشینی هەندێک لەو جلوبەرگانە دەکات، ئومێدەوار بو کە بیتوانایە بیانپۆشێت، بەڵام ئەو بارودۆخە ژیانییەی کەتیایەتی و ئەو روبەندەی کە داویەتی بەسەر روخساری دا، ناچاری دەکات تەنها یەک جۆر جلوبەرگ لەبەر بکات.**

کوێسـتان، لەگەڵ هاوسەرگیرییکردنی دا، مێردەکەی ناچاری کردوە کە روبەند «نیقاب» بدات بەسـەر دەموچاوی داو دەستبەرداری ئەو جلانە بێت کە پێشتر لەبەری کردون.

ئەم ژنە نمونـەی چەندین ژنی دیکەیە کەلەماوەکانـی رابردودا ژمارەیان لەنێو کۆمەڵگـەدا زیادی کـردوە، لەکاتێکدا دیمەنی ژنی روبەنـد پۆش، دیمەنێکی تارادەیـەک نامۆیـەو لەکۆمەڵگـەی کوردەواریـی دا بەتایبـەت لـە کۆتا چارەکی سـەدەی بیسـت تا ئێسـتا، نمونەی کەم بوە.

ژنانێـک لەگەرمیان رویان لەپۆشـینی روبەند کـردوە، بەتایبەتیـش لەگەڵ پەرەسـەندنی تەوژمـە ئاینییـە توندڕەوەکان و گروپە داخـراوەکان، پۆشـینی روبەندیـش لـەزۆر جێگای جیاوازی وەکوە بازاڕ و زانکۆ و شوێنە گشتیەکانیشدا دەبینرێت.

هەندێک لـە ژنان باسـلەوەدەکەن کە بەخواستی خۆیان روبەندیان نەکردوە، بەڵکو بۆ رازییکردنی هاوسەرەکانیانە.

کوێسـتان، یەکێکە لـەو ژنانە. ئەو بۆ (نەوژیـن) وتی: «من خـۆم ئارەزوی ئەوەم نیە ئەمجۆرە نیقابە بکەم، بەڵام کە زەواجم کرد و هاوژینەکەم سەلەفیە، داوای کـرد کە بیکەم، منیش ناچاربوم بەقسەی بکەم.»

هاوڕێیەکم نیقابی دەکرد، بۆیە منیش چومە سەر رای ئەو

ئەو باسیلەوەشکرد ئەگەر پابەند نەبێت بـەم مەرجەی هاوسـەرەکەیەوە، ئەوا هاوسەرەکەی تەڵاقی دەدات «لەوانەیە بێتە هۆی جیابونەوەشمان، بۆیە بڕیارم داوە کە بەقسەی ئەو بکەم و ئەم جۆرە نیقابە بکەم».

بەڵام بەپێچەوانەی ئەو ژنەوە، (سارا) ژنێکـی دیکەیە کە روبەنـدی کردوە، باسـلەوەدەکات کە بەخواسـتی خۆی ئەوکارەی کردوە.

بۆ (نەوژین) وتی: «من هیچ کەسـێک زۆری لێنەکردوم کە نیقاب بکەم، بەڵام خۆم ویستم لەسەری بوەو بەردەوامیش ئەبم».

وتیشی: «ئارەزومە هەمو کچان نیقاب و ئەم جۆرە جلانەی من لەبەر بکەن».

ئەگەرچی نیقاب بۆ کۆمەڵگای کوردیی تاڕادەیەکـی زۆر نامۆیـەو دیاردەیەکە پێشینەی کەمە، بەڵام لەوڵاتانی دیکەی ئیسلامییدا، بەتایبەت لەو کۆمەڵگایانەی کە بە موحافیزکار ناسراون، دیاردەیەکی ئاسایی و بڵاوە، تەنانەت لەو ناوچانەی عێراقیش کـە بە توندوتیژیـی ئاینی ناسـراون، ئـەم دیاردەیـە لەمێژەوە تائێستا بونی هەبوەو هەیە.

پرسـیارەکە ئەوەیـە ئایا ئـەم کارە نەریتە یان شـەرع؟ ئایا کارێکە رەگی ئاینیی هەیە یان پەیوەندی بەکەلتوری عەرەبەوە هەیە؟

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە، جاسم کەلاری، ئیمام و پێشنوێژی مزگەوتی (عەبدولقادر گەیلانی) لەکەلار دەدوێنین.

ئەو بـۆ (نەوژیـن) وتـی: «لەئاینی ئیسـلامدا کردنی روبەنـد بۆ ئافرەتان سـونەتە و هەندێک لەزانایانیش دەڵێن فەرزە».

ئـەو زانا ئاینییە نەیشـاردەوە کە ئەم جۆرە کار و جلوبەرگانە، بەپلەی یەکەم بە کۆمەڵگاکە کەوتوە. لەوبارەوە وتی: « پۆشـینی ئـەو جـۆرە جلوبەرگانە لەکۆمەڵگەیەکـەوە بۆکۆمەڵکەیەکی تر دەگۆڕێت».

لەنێو هەمو جلوبەرگە ئیسلامیەکان دا، زیاتر لە هەر جۆرێکیان، نیقاب لەسـەر ئاسـتی وڵاتانی رۆژئاوا، باسوخواسی خستوەتەوە، تاگەیشتوەتە ئەو ئاستەی کەلەهەندێک لـەو وڵاتانە دا قەدەغەی بکەن.

م.جاسم کەلاری، لەگەڵ قەدەغەکردنی ئەمجۆرە لە پۆشاک نیە، بەڵکو پێیوایە ئەبێـت ئازادیـی بەکەسـەکان بدرێت بـۆ کردنی یان نا. لەوبـارەوە دەڵێت: «نیقـاب لەکۆمەڵگای کوردیدا بەکەمی دەبینرێت، بەڵام ئازادییش دراوە پێیان، چۆن ئازادی دراوە بە کچان کە سـفور بن».

ئەگەر بۆ هەندێک لە ژنان کردنی روبەند ناچاریـی بێـت و بۆ هەندێکـی دیکە بەخواستی خۆیان بێت، ئەوا بۆ هەندێکی دیکـە مەسـەلەکە لاسـاییکردنەوەو چاولێکردنی دەوروبەرە.

گوڵاڵـە، کچێکی روبەند پۆشـە، ئەو یەکێکە لەوانەی کە بەهۆی چاولێکردنەوە بڕیاری روبەند پۆشینی داوە.

ئەو بـۆ (نەوژین) وتی: «سـەرەتای دەرکەوتنم وانەبوم، بـەڵام هاوڕێیەکم ئەم جلانـەی لەبەردەکرد، بۆیە منیش چومە سـەر رای ئەو و منیش ئێسـتا روبەند دەکەم و باڵاپۆشم».

دانی بەوەشـدا نا کـە روبەند و نیقاب کـردن بـەلای خەڵکییـەوە کارێکی نامۆیە و مایەی سەرسوڕمانیانە «بۆیە هەندێکجار توشـی کۆمێنـت وتوانجی خەڵکی دەبینەوە».

### «پێیانباشە قەیرە بن، بەڵام شو بەکەسانی دەرەوەی خۆیان نەکەن»

# کچانی کاکەیی .. قوربانیی بیروباوەڕی ئاینیی و پلەبەندیی کۆمەڵایەتیین

▪ نەوژین، گوڵباخ حەسەن

**زۆربەی کات هاوسەرگیری بەوە دەناسرێت کە جگە لەوەی بەیەک گەیشتنی دو مرۆڤە، هاوکات دروستکردنی دۆستایەتییشە لەنێوان دو بنەماڵەو دو خێزان، بەڵام بۆ (ل.هـ)، هاوسەرگیرییەکەی نەک نەبوە هۆی پتەوکردنی پەیوەندی بنەماڵەی خۆی و هاوسەرەکەی، بەڵکو دەرەنجامەکەی وا کەوتەوە کە بنەماڵەکەی «حاشای لێبکەن» و قسەی لەگەڵ نەکەن.**

ئەو ژنێکی تەمەن (٣٠) ساڵی کاکەییە، شوی بە کوڕێکی موسوڵمان کردوە، ئەمەش کارێکە بەپێی بیروباوەڕە ئاینییەکەیان، وەکو تاوان هەژمار دەکرێت، هەربۆیە لەسەر ئەو کارە توشی چەندین کێشە بوەتەوە.

کاکەییەکان، پێکهاتەیەکی ناسراو و لەمێژینەی کوردستان و گەرمیانن بەتایبەت، ئەوان لەوەتەی مێژو نوسراوەتەوە لەم دەڤەرەدا، نیشتەجێن.

ئەگەرچی لە زۆر رو و زۆر بواردا تێکەڵی موسوڵمانان بون، بەڵام لەروی هاوسەرگیریی و «ژن و ژنخوازییەوە»، پارێزگارییان لە تێکەڵبون کردوە.

بۆچون زۆرە لەبارەی بنەماکانی کاکەییەوە، هەیە بە ئاین ناوی دەبات و هەیە بە ئاینزا، هەیە بە موسوڵمانیان دادەنێت هەیە بە زەردەشتی، هەیە بە لقێک لە لقەکانی شیعە غوڵاتەکان وەسفیان دەکات و هەشە بە ئاینزایەکی سەربەخۆی ئیسلامیی. بەوهۆیەی بیروباوەڕی کاکەیی داخراوە بۆ کەسانی غەیرە خۆیان، بۆیە تائێستا چیەتی ئەم بیروباوەڕە بەتەواوی رون نەبوەتەوە.

ئەوەی لەروی پلەبەندی کۆمەڵایەتییەوە لەو بیروباوەڕەدا ئاشکرایە، ئەوەیە کە ئەوان لەنێو خۆیاندا سێ پلەی کۆمەڵایەتییان هەیە: (مرید، پیر و دەلیل)، کەلەناو خەڵکی دا بە (سەید، باوەو عەوام) ناودەبرێن.

هاوسەرگیریی لەنێوان ئەم پلانەدا زۆر کەمەو لەهەندێک باریشدا قەدەغەیە، سەید و باوە لەنێوان خۆیاندا هاوسەرگریی دەکەن، بەڵام لەگەڵ چینی خوارەوەدا نایکەن و رێگەپێنەدراوە، هەروەک هاوسەرگیریی لەدەرەوەی خۆشیان و لەگەڵ ئاینەکانی دیکە کارێکی قەدەغەیە.

ئەگەرچی هەندێک حاڵەت هەبون کە کوڕی کاکەیی کچی موسوڵمانی هێناوە، بەڵام بەپێچەوانەوە شوکردنی کچی کاکەیی بە کوڕی موسوڵمان، زۆر کەم و دەگمەنە، چونکە ئەم کارە ژن و خێزانەکەی روبەروی «نەفرەتی کۆمەڵایەتی» دەکاتەوە.

(ل.هـ)، ئەو ژنەی لەسەرەوەی ئاماژەمان بە چیرۆکەکەی کرد، ژیانی پێکهێناوە لە گەڵ کوڕێکی موسڵمان و خاوەنی کچێکە. باسیلەوەکرد کە ماوەی ٤ ساڵە هاوسەرگیریی کردوەو هەر لەسەرەتاوە تائێستا، روبەروی کێشە و ئاستەنگ بوەتەوە.

ئەو بۆ (نەوژین) وتی: «کە هاوسەرگیرییم کرد، جگە لە باوکم، خێزانەکەم لارییان نەبو، بەڵام بنەماڵەکەم حاشایان لێکردم و قسەم لەگەڵ ناکەن.»

وتیشی: «لەدوای هاوسەرگیریکردنم لەگەڵ کەسێکی غەیرە کاکەیی یەک کەسوکاری کاکەیم پیوەندیان لەگەڵم نەماوە، جگە لەخێزانەکەی خۆم هەموو دەرگاکانی هاتوچۆکردنم لەگەڵ داخراوە».

بەخەمباریشەوە ئەوەی وت کە قسەو قەسەلۆکی بۆهەڵدەبەستن و تەنانەت کاتێکیش لەرێوبانەکاندا دەیبینن سڵاوی لێناکەن و روی خۆیانی لێوەردەگێڕن.

کچانی کاکەیی، هەر لەسەرەتاوە بەوەرادەهێنرێن کە بواری هاوسەرگیرییان سنوردار و دیارییکراوە، ئەوان جگە لە ئاین و پلەی کۆمەڵایەتی خۆیان، ناتوانن لەگەڵ کەسانی تر ئەگەر دڵخوازیشیان بێت، هاوسەرگیریی بکەن، بەمهۆیەشەوە زۆرێکیان روبەروی قەیرە بون دەبنەوە.

(ر)، کچێکی کاکەیی تەمەن (٤٠) ساڵانە. باسلەوەدەکات ئاینی کاکەیش وەک هەردینێکی تر کۆمەڵێک رێساو یاسای هەیە بەتایبەت بۆ ئافرەت قورسەو «بەناچاریش ئێمە قەبوڵمانکردوە».

دەشڵێت: «رێساکان تارِادەیەک بۆ کوڕانی کاکەیی ئاسانترە، بەڵام بۆ ئافرەت زۆر سەختە، من دەبێت یان ژیانی هاوسەرگیری لەگەڵ خزمەکان و دەوروبەرەکەی خۆم پێکبێنم یان ئەبێت چاوەڕوانی رەحمەتی کەسێک بکەم کە لە هەمان تەبەقەی دینی خۆم بێتە خوازبێنیم».

بەرای ئەو کچە، ئەم بارودۆخە وایکردوە لەهاوسەرگیریی دا کچان زۆرتر روبەروی ئاستەنگ ببنەوە هەتا کوڕان «ئەمەیە وایکردوە کچانی کاکەیی ژمارەیەکیان لە پرۆسەی هاوسەرگیری بێبەشبن و بەکچێتی بمێننەوە، لەبەرامبەریشدا کوڕانی کاکەیی کام کچە جوان و ناسک و مناڵە دەیخوازن و گەورەکانیش دەمێننەوە».

سەرباری هەمو ئەم لێکەوتانەش لەسەر کچانی کاکەیی، بەڵام پیاوانی ئاینی یان ئەوانەی پێیان دەوترێت گەورەو دەمسپی، جەختلەوەدەکەنەوە کە کچەکانیان بۆیان نییە هاوسەرگیریی لەدەرەوەی خۆیان بکەن.

سەید حەیدەر دەروێشی، کەسایەتی ئاینی کاکەیی، بۆ (نەوژین) وتی: «رابەرانمان رێنماییان داوە غەیری تایفەی خۆمان هاوسەرگیری نەکەین».

وتیشی: «ئافرەتی کاکەیی مافی نییە هاوسەرگیری لەگەڵ غەیری دینی خۆی بکات».

لەبارەی سزای ئەو کچانەوە کە هاوسەرگیری لەگەڵ کەسانی غەیرە دینیان دەکەن، (مازن) کە کوڕێکی کاکەییە، باسیلەوەکرد کە هەندێکجار سزاکان



**کچان و کوڕانی کاکەیی لە یەکێک لە سروتە ئاینییەکانیان دا مۆزیک دەژەنن**

گەشتونەتە کوشتن!

ئەو بۆ (نەوژین) وتی: «لەرابردودا سزای ئەو کچانەی هاوسەرگیریی لەگەڵ غەیرە دینیان دەکەن، کوشتن بو، بەڵام ئێستا ئەو حاڵەتە نەماوەو بەڵکو سزاکان بوەتە سڕکردنی رۆڵی کۆمەڵایەتی و بەرکەوتنی نەفرەتی کۆمەڵگای کاکەیی ولەپاڵ نانی ناو و ناتۆرە».

بەڵام (باوە حەمید رەشید)، یەکێک لە کەسایەتییە دیارەکانی کاکەیی لەکوردستان و گەرمیان، بۆچونێکی تری هەیەو پێیوانیە سزاکان هێندە قورس بن.

وتی: «ئەگەر کەسێک کارێکی وابکات ئەوە ئێمە پێمان خۆشنیەو ئەو کەسەمان خۆشناوێت کە وایکردوەو دەست خۆشی لێناکەین».

وتیشی: «لەناو کلتورەکەی ئێمەدا ئافرەت سەرپشکە لە هەڵبژاردنی هاوبەشی ژیانی خۆی، بۆنمونە هاوسەرگیری بەشێوەیەکی گشتی لەنێوان چینی سەید و باوەدا ئەکرێت، بەڵام ئێمە چینێکی ترمان هەیە کە چینی ئاساییە یان چینی خوارەوە بۆیان نیە لەگەل سەید و باوە زەواج بکەن».

باوە حەمید، ئاماژەی بەوەشکرد سەباری ئەو رێسایانە، بەڵام رویداوە لەنێوان باوە و چینی ئاسایدا زەواج کراوە، بەڵام ئەوە لە گەرمیان نەبوە بەڵکو لەناوچەکانی هەولێر و کەرکوک دا بوە.

ئەوەشی وت کە بەلای ئەوانەوە پەسەندە لە نا و خۆ یا ندا ها و سە رگیریی بکەن «ئێمە ئا فرە تمان نادەین بە خەڵکی دەرەوەی ئاینی کاکەیی، ئەگەر ئەوەش روبدات ئەوە بەلامانەوە پەسەند نیە، نەهیان لێناکەین، بەڵام پێشمان خۆشنیە و پشتگیری ناکەین».

ئەم سنوردارکردنە لە یەکێک لە مافە گرنگ و بنەڕەتیەکانی ژیانی مرۆڤ کە هاوسەرگیریی و دەستنیشانکردنی هاوسەرە بەدڵی خۆت، وایکردوە لەنێو نەوەی نوێی کاکەییەکان، جۆرێک لە ناڕەزایەتی و نیگەرانی دروست بێت، ئەوان ئەم بنەمایە رەد دەکەنەوە یان پێیان باش نییە کە نەتوانن بەدڵی خۆیان هاوسەرگیریی بکەن.

مازن، نیگەرانی لە رێساو بنەما ئاینییەکانیان دەربڕی لەبارەی هاوسەرگیرییەوە .وتی: «ناڕەزایەتیەکی زۆرم هەیە لەو سنورانەی بۆم دانراوە لەبەردەم زەواج کردندا».

لەیلا سەلیمی، کە کچە رۆژنامەوانێکی کاکەییە، نیگەرانە لەکۆتوبەندەکانی هاوسەرگیریی کچان لەلای بیروباوەڕەکەیان. بۆ (نەوژین) وتی: «بونی تەبەقەو چینی کۆمەڵایەتی، کچانی ئێمەیان کردوەتە قوربانی، ئێستا لەنێو هەر خێزانێکی کاکەیی چەندین کچ ماونەتەوەو بون بە قوربانی کلتوری فیکری سەقەت، ئەمەش خەسارەتێکی گەورەیەو دەبێت هەنگاوێک بۆ چارەسەرکردنی هەڵبگیرێت».

بەڵام لەبەرامبەردا ئەگەر کچانی کاکەیی بێبەشکرابن لەوەی بەخواستی خۆیان و لەدەرەوەی بیروباوەڕە ئاینییەکەیان هاوسەرگیریی بکەن، کوڕانێکیش هەن کەبەهۆی ئەوەی کاکەیین، لەدەرەوەی بیروباوەڕەکەی خۆیان رێگەنەدراوە هاوسەرگیریی بکەن و بە کچانی دڵخوازیان بگەن.

ئاراس زۆراب، کوڕێکی رۆژنامەنوسیی کاکەییە. باسلەوەدەکات کە پەیوەندی سۆزداری لەگەڵ کچی غەیرە ئاینی خۆی هەبوە، بەڵام بەهۆی جیاوازی ئاینییەوە رازی نەبون هاوسەرگیریی لەگەڵ دا بکات.

ئاراس پێشیوایە کە راستە رێگریی دەکرێت لەوەی کچانی کاکەیی شو بەکەسانی غەیرە بکەن، بەڵام پێشوایە ئەم حاڵەتەش پەیوەستە بە ئاستی هۆشیاریی و رۆشنبیریی خێزانەکانیشەوە.

(لەیلا سەلیمی)ش، هاوڕایە لەگەڵ ئەم بۆچونەو باسلەوەدەکات کە ئەو بابەتە پەیوەندی بە خودی خێزانەکانەوە هەیە، بەڵام پێشیوایە هەمو ئاینەکان ناهەقی بەرامبەر بە کچان دەکەن «ئەو ناهەقیەی لە نێو کاکەیی دا بەرامبەر بە کچان دەکرێت لەنێو ئاینەکانی تر زیاتر بەرچاو دەکەوێت».

سەرباری ئەمانەش، بەڵام بەهۆی ئەوەی بەرنەفرەت و حاشالێکردنی بنەماڵەو بیروباوەڕەکەیان نەکەون، کچانی کاکەیی کەمتر دەوێرن ئەم بنەمایە بشکێنن و شو بەکەسانی دەرەوەی بیروباوەڕەکەیان بکەن.

(ل.هـ)، لەوبارەوە وتی: «ئەگەر کچێک بیەوێ ئەوکلتورە بشکێنێت زەحمەت ئەکێشیت وەکو ئەوەی من بینیم، بەڵام بینینی ئەو زەحمەت و کێشانە، هێشتا لەوە باشترە کە بەخواستی ئەوان و بەنابەدڵی و ناچاری شو بکەیت».



# بەشێک لە خێزانەکان ناهێڵن کچەکانیان لە دەرەوەی شار بخوێنن



■ نەوژین، ژینۆ عەلی

**لەو ماوەیەدا کەلەئامادەیی خوێندویەتی، (ڕێژان) ئەوەی ویستوەو حەزی لێبوە ئەوەبوە کەبتوانێت نمرەیەکی باش بەدەست بێنێت و لەو کۆلێژە درێژە بەخوێندن بدات کەدەیەوێت، بەڵام ئەگەرچی نمرەی پێویستی بۆ خوێندن لەو کۆلێژە بەدەستهێنا، کەچی ڕێگرییە خێزانییەکان، خەون و ئاواتەکەیان پوچەڵ کردەوە.**

ئـەو نمونەیەکە لەو کچانەی کە بەهۆی ڕێگـری خێزانەکانیان لـەوەی نابێت لـە شـارێکی تـری دەرەوەی کەلار و زانکۆیەکـی تـری دەرەوەی گەرمیان بخوێنن، ئەو حەزانەی لەبواری خوێندن دا هەیانبوە، بەدیی نەهاتوەو بەناچاری رویان لـە کۆلێژ و بواری تری خوێندن کردوە.

ژمارەیـەک لە کچانـی گەرمیان، پاش تەواوکردنی خوێندنی ئامادەیی، بەهۆی زاڵبونی ئەو کلتورەی کەتائێستاش ژنان بەلاواز دەبینێت، ڕێگـە بەمناڵەکانیان نادەن لە شـارەکانی دەرەوەی ناوچەی خۆیان درێژە بەخوێندنی زانکۆیی بدەن، بەڵکو ناچاریان دەکەن دەسـتبەرداری ئەو حەزەیان ببن و لەکۆلێژ و بوارێکی تر لەناوچەکەی خۆیان بخوێنن.

ڕێژان، کەناوی خـوازراوی کچێکە، بۆ (نەوژین) وتی: «ئارەزوی من ئەوەبوە بچمـە ئەو بەشـەی کەچەندین سـاڵ هەوڵم بـۆ دا، خۆشـبەختانە لەپۆلی دوانزە دا نمرەیەکی بەرزم بەدەستهێنا، بەڵام ماڵەوە بونە ڕێگر لەبەردەم ئەوەی کەمن بچم ئەو بەشە بخوێنم، چونکە لە زانکۆی سلێمانی بو».

وتیشـی: «کـە ماڵـەوە ڕێگربـون، ناچاربـوم ئەوبەشـەی کەنـاوم لێی هاتبوەوە دایبەزێنم بۆ زانکۆی گەرمیان و بۆبەشـێک کەخۆم هیـچ ئارەزویەکم لێی نەبو».

ڕێگـری و کۆسـپەکانی خێـزان لـە خەونەکانی کچان بەگشتی و خوێندنیان بەدڵی خۆیـان بەتایبەتی، دەبێتەهۆی کەمکردنـەوەی داهێنـان، چونکە ئەو کچانە کاتێک ناچـار دەکرێن لە بەش و بوارێکـدا بخوێنن کە خۆیان بەدڵیان نیە، حەوسـەڵەو ئارەزویان بەگشـتی سسـت دەبێت، ئەمەش کار لە ئاستی داهێنانیان دەکات.




کەریم مەدحەت، ماستەر لە دەرونناسی، لەوبـارەوە بۆ (نەوژین) وتی: «ڕێگری و کۆسـپەکان لەبەردەم کچان دەبێتە هۆی لەناوبردنی حـەز و خولیاکانیان، کە بەهـەوڵ وماندوبونـی خۆیان ئەو نمرەیەیان هێناوەو ناتوانن لەو بەشـە بخوێنن کە ئارەزویانە، ئەمەش دەبێتە هۆی لەناوبردنی ئەو داهێنانەی کە ئەو کچانە لەمێشکیاندایە».

ئەو شارەزایەی دەرونزانی، زیاتر ئاماژەی بەمەترسـیەکانی ئـەم حاڵەتە کرد و باسـیلەوەکرد لەروی دەرونییەوە ئەم کارە هەندێکجار کچان تێکدەشـکێنێت و ڕەنگە سـەر بکێشێت بۆ دروستبونی گرێ و نەخۆشیی دەرونی.

لەپاڵ کلتورو دابونەریت و ئەو ڕێگریانەی کە بونەتە بەربەسـت لەبەردەم کچانی کۆمەڵگەی کـوردی دا، هۆکاری تریش هەن کە خێزانـەکان بەهۆیەوە ڕێگری لەکچەکانیـان دەکـەن لـە دەرەوەی شارەکان بخوێنن، لەو هۆکارانەش باری دارایی وئابورییانە.

روخۆش، کە ناوی خـوازراوی کچێکی خوێنـدکارە، ئەویـش بەهەمانشـێوە ڕێگریی لێکراوە لە دەرەوەی شار و لەو بەشـەی خۆی ویسـتویەتی بخوێنێت.

بۆ (نەوژین) وتـی: «من جگە لەوەی کە ماڵەوەمان ئاسـتی ڕۆشـنبیری و هۆشـیاریان کەم بو، لەپاڵ ئەوەشـدا باری دارایمان هی ئەوەنەبو کەمن بچمە زانکۆی سلێمانی بخوێنم، بۆیە ناچاربوم کۆلێژەکەم دابەزێنم و لێرە بخوێنم».

سـەرباری لایەنی مادی، بەڵام هێشتا بەشـێکی زۆری ڕێگریـەکان، ڕەگـی کەلتوریـی یـان ڕۆشـنبیرییان هەیە، بەتایبـەت لەو خێزانانەی کە ئاسـتی تێگەیشـتنیان لاوازترە. ئەو خێزانانە تائێسـتا کچان بەلایانەوە جێگەی ئەو متمانەیـە نین کە بتوانـن بەتەنیا بۆ شارێکی تر بیان نێرن بۆ خوێندن.

کەریم مەدحـەت، پێیوایە ئەم کارە بۆ هەڵە لێکدانـەوەی کۆمەڵگە لە ئاین و خراپی دابونەریتەکان دەگەڕێتەوە.

ئەو وتی: «بەهەڵەتێگەیشتن لە ئاین و کۆمەڵگەو دابونەریت و کەمی هوشیاری لەنـاو کۆمەڵگـە، هـۆکارن بۆئەوەی جیـاوازی بکرێت لەنێوان کچان وکوڕان وهەروەها بەکەم سەیرکردنی کچان».

جەختیشـیکردەوە کە ئـەم تێڕوانینە کۆمەڵایەتییە هەڵـەو ناتەواوە، چونکە وەکخۆی وتـی: «هەندێکجار ئەو توانا و زیرەکییـەی لەکچان دا بونی هەیەو بەدیـی دەکرێت، لەلای کوڕان دا بەدی ناکرێت».

---

### لە پرۆگرام دا هەیەو لە واقیع دا نییە

# کچانی خوێندکار لەوانەی وەرزش بێبەش دەبن

■ نەوژین، پەیام لەتیف

**ئەگەرچی وەکو پێداویستییەکی جەستەیی گرنگ ناسێنراوە، سەرباری ئەوەی وانەی لە پرۆگرامەکانی خوێندن بۆ دیارییکراوە، کەچی لەناوەندەکانی خوێندن دا لەگەرمیان گرنگییەکی ئەوتۆ بە وەرزش نادرێت، بەتایبەت بۆ کچان، بەڵکو زۆر بەکەمی کچان لە ناوەندەکانی خوێندن وەرزشیان پێدەکرێت.**



هۆکارەکان چین؟ کێ کەمتەرخەمە لەم پرسـە؟ بۆچی وەرزش ئـەو بایەخەی نییـە؟ کچان خۆیان گـوێ بەم وانەیە نادەن یان مامۆستایان هانیان نادەن؟ کچانی خوێندکار و مامۆسـتایان، لەم ڕاپۆرتـەدا بۆچونەکانی خۆیان دەخەنە ڕو.

### نەریتە دواکەوتوەکانی کۆمەڵگە

سـەرگوڵ خەلیل، کچە خوێندکارێکی ئامادەییـە، باسـلەوەدەکات کـە «کۆمەڵگـەی ئێمـە کومەڵگەیەکـی داخـراوە بەڕوی ئافـرەت دا، ئەگەرنا هەمـو کچێک حەزی لـەوەرزش هەیە وحـەزدەکات بەپراکتیکـی ئەنجامـی بـدات، بەڵام بەهۆی ئـەوەی کچ وکوڕ لەقوتابخانەکاندا تێکەڵن ومامۆستاکان زیاتر گرنگی بەکوڕان دەدەن، وایکردوە بەتەواوی لە وەرزش دوربکەوینەوە.»

### خوێندنگەکان جیاوازییان هەیە

شەیما ئەحمەد، خوێندکاری ئامادەیی، بۆچونی وایە کە لەم وانەیەدا جیاوازی هەیە لەنێوان خوێندنگەکانی تایبەت بە کچان و خوێندنگە تێکەڵاوەکان.

ئەوبۆ (نەوژین) وتی: «لەقوتابخانەکانی کچاندا مامۆسـتا قوتابی ناچاردەکات کەبـە پراکتیکـی وەرزش ئەنجامبدات ودەبێـت هەمو کچێکیش ئامادەبێت کە وەرزش بکات».

ئاماژەی دا لـە قوتابخانە تێکەڵاوەکان بەوشێوەیە نیە.

### نەبونی جلی وەرزشی

گـۆران محەمەد، ماموسـتای وەرزش لەقوتابخانەی کوردۆ قاسـمی بنەڕەتی لەکەلار، لەبارەی ئەم پرسەوە دەڵێت: « زۆرجـار لەماڵەوە ڕێگـری دەکرێت لەکچان کەجلی وەرزشی لەگەڵ خۆیان بهێنـن بەهۆی دابونەریتـەوە، ئەمەش وادەکات نەتوانن بەشدار بن لەو وانەیەو وەرزش بکەن، چونکە وەرزش بە جلی تایبەتەوە دەکرێت».

### سوربون لەسەر وەرزشکردن

هەندێـک لەکچانیش حـەز لە وەرزش دەکـەن وبەپراکتیکیـش ئەنجامـی دەدەن.

سـەرباری هەمـو کێشـەو گرنگیـی پێنەدان و ئاستەنگیەک، بەڵام کچانێک هەن کـە ئـەم وانەیەیـان لا گرنگەو بەشـداریی تێدا دەکەن لەروی کرداریی «پراکتیکییەوە».

سۆزیار مەریوان، خوێندکاری بنەڕەتی، لەوبـارەوە وتی: «من هەمـو کاتێک وەرزش دەکـەم و زۆر حـەز بە وانەی وەرزش دەکـەم و بـە پراکتیکیـش ئەنجامـی دەدەم، لەپۆلەکـەی ئێمـە هەمو کچەکان وەک من بەشدارن، بەڵام لەپولەکانی تر هەندێک کچ هەیە دەڵێن وەرزش ناکەین».

### بایکۆت و گرنگیی نەدان

بایکوتی ماموستایان وایکردوە زورجار وانـەی وەرزش لەلایەن مامۆسـتاکانی ترەوە پـڕ بکریتەوە بـۆ تەواوکردنی پرۆگرامی خوێندن. وەک (سـەرگوڵ) وتی: «ماوەی دو سـاڵە بە نەزەریش وانەی وەرزش ناخۆینرێت».

سەرباری ئەوەش، ئەو کچە خوێندکارە وەلا نانـی ئـەم وانەیـە، بەشـێکی بـۆ کەمتەرخەمـی مامۆسـتاکان دەگەڕێنێتەوە. وتی: «ماموسـتاکانی وەرزش هیـچ گرنگی بەکچـان نادەن، ئیمە چەندین جـار داوامانکردوە کە لە چالاکی قوتابخانەکاندا بەشداری بکەین وەک گورەپان و مەیدان و بالە و تۆپی پێ، بەڵام داواکانمان پشتگوێخراوە».

بەڵام (م.گـۆران محەمـەد)، دەڵێت: «ئەگەر گرنگی نەدانێکیش هەبێت ئەوە خودی کچان خۆیان هـۆکارن، چونکە بڕواناکـەم ئەگـەر کچان حـەز بکەن بەشـداربن مامۆستایان پشـتگوێیان بخەن».



# قەیرانی دارایی ژنانی لە سەردانی ئارایشتگاکان خستوە

■ نەوژین
سەرگوڵ خەلیل – ئالا عەزیز

**قەیرانی دارایی لەپاڵ کاریگەری دروستکردن لەسەر تەواوی لایەنەکانی ژیان لە هەرێمی کوردستان کاریگەریشی لەسەر ئارایشتگاکانی ئافرەتان هەبوە، بەپێی وتەی خاوەنی ئارایشتگایەک سەردانیکردنیان لەچاو جاراندا زۆر کەمیکردوە .**

دایکی ئاری، خاوەنی ئارایشتگای ئاریا لەکەلار کە یەکێکە لە ئارایشتگا کۆنەکانی قەزاکە بۆ (نەوژین) وتی: «ئەگەرچی ئێمە لە زۆر کۆنەوە لە شارەکە ناسراوین و کەسانێکی زۆر دەماننناسن و سەردانمان دەکەن، بەڵام ئێستا سەردانیکردن لەچاو پێش قەیران زۆر کەمیکردوە» .

ئەو وتیشی : «بەجۆرێک رێژەکە کەمیکردوە کە ئەتوانین بڵێین جیاوازی نێوان ساڵانی پێش قەیران و لەقەیراندا لەسەدا ٧٠ سەردانیکردن کەمیکردوە» .

سەبارەت بەوەی ئەوان تاوەکو چەند هاوکاری هاوڵاتیان دەکەن لە قەیراندا، دایکی ئاری وتی: «هاوکاری خەڵک زۆر دەکەین بەتایبەت بۆ کەسوکاری پێشمەرگە» .

قەیرانی دارایی و کەمی سەردانیکردن بۆلایان، وای لەخاوەنی ئارایشتگاکان کردوە کە نرخی ئارایشت و بابەتەکانی جوانکاریی لەچاو پێشودا کەمبکەنەوە، هەروەک دایکی ئاری نەیشاردەوە کە ئەوان نرخەکانیان زۆر کەمکردوەتەوە .

بەپێی ئەو ئامارانەی دەزگا فەرمیەکان لە هەرێمی کوردستان بڵاویدەکەنەوە هاوسەرگیریکردن لە هەرێمی کوردستان بەشێوەیەکی بەرچاو کەمیکردوە و ئەمەش بەپلەی یەک بەپێی وتەی خاوەنی ئارایشتگاکانی ئافرەتان کاریگەری کردوەتە سەر کاری ئەوان، هاوکات دواکەوتنی موچەی فەرمانبەران کاریگەری هەبوە لەسەردانیکردنی ئەو کەسانەی کە فەرمانبەرن بۆ ئارایشتگاکان .

پەروین عەلی، مامۆستایەکی قەزای کەلارە، ئەو بۆ (نەوژین) وتی: «بەجیاواز لە پێشو لە ئێستادا بەهۆی نەهاتنی موچەوە سەردانیکردنم بۆ ئارایشتگاکان کەمکردوەتەوە، بەجۆرێک کەچەند مانگ جارێک سەردان دەکەم» .

جگە لە فەرمانبەرانی ئافرەت کە خاوەنی داهاتی سەربەخۆی خۆیانن کەم دەچنە ئارایشتگاکان، ژنانی ماڵەوەش رێژەی سەردانی ئارایشتگاکانیان کەم کردوەتەوە .

نەجیبە ئەحمەد، ئافرەتێکی ماڵەوەیە، بۆ نەوژین باسی لەوەکرد: «ئەگەر پێشتر ١٥ رۆژ جارێک چوبێتمە ئارایشتگاکان، ئێستا دو مانگ جارێک یان زیاتر ناچم» .

ئەوەشی وت: «پێشتر لەکاتی ئاهەنگەکان و کاتە ئاساییەکانیش ئەچوم بۆ ئارایشتگا، بەڵام ئێستا بۆ ئاهەنگەکانیش زۆر بەکەمی ئەتوانین بچینە ئارایشتگاو لەماڵەوە کاری ئارایشت بۆخۆمان دەکەین» .

بەپێی ئامارێک لە سنوری قەزای کەلارو ناحیەکانی دەوروبەری، زیاتر لە ٥٠ ئارایشتگای ئافرەتان بونیان هەیە، ئەگەرچی قەیرانی دارایی هەیەو کاریشیان کەمیکردوە، بەڵام بەپێی وتەی بەرپرسێک ئەمە کاریگەری نەکردوەتە سەر کەمکردنەوەی ژمارەی ئارایشتگاکان، بەڵکو زیادیشیان کردوە .

عومەر محەمەد، سەرۆکی لقی گەرمیانی سەندیکاکانی کرێکاران و پیشەوەرانی کوردستان، بە (نەوژین)ی راگەیاند: «چەندین کەس هەن داوای کردنەوەی ئارایشتگا دەکەن، بەڵام بەهۆی ئەوەی کاریگەری نەکاتە سەر ئارایشتگاکانی تر بۆیە پێدانی مۆڵەتمان راگرتوە» .

یەکێک لەو لایەنانەی کە چاودێری نرخی ئارایشتگاکان دەکات، چاودێری بازرگانی گەرمیانە . بەپێی وتەی بەڕێوەبەرەکەی، ئەوان لە رێگەی لیژنەکانیانەوە بەدواداچونی وردیان لەسەر کاری ئارایشتگاکان و نرخەکانیان هەیە .

حیکمەت ئەحمەد، بەڕێوەبەری چاودێری بازرگانی گەرمیان، بە (نەوژین)ی راگەیاند: «ئێمە لیژنەیەکی تایبەتمان هەیە بۆ ئارایشتگاکان و نرخەکانیان و نابێت نرخەکانیان زۆربێت و لەکاتی بونی بەرزی نرخدا سزایان ئەدەین» .

باسیلەوەشکرد: «لەپاڵ چاودێریکردنی نرخەکاندا چاودێری ئەو کەرەستەو ماددە جوانکاریانەش دەکەین کە بەکاری دەهێنن بەتایبەت کاتی بەسەرچونەکەی» .

# بۆ یەکەمجار لەگەرمیان.. چێشتخانەیەکی کوردەواریی بە ستافێکی ژنەوە دەکرێتەوە



■ نەوژین، سازان مستەفا

**ئەگەر چی دانانی چیشتخانە وەکو پیشەیەکی پیاوانە لەکۆمەڵگەی ئێمەدا سەیر کراوە، بەڵام ژمارەیەک ئافرەت لە کەلار ئەم تێڕوانین و نەریتە دەگۆڕن وپێکەوە چێشتخانەیەکی کوردەواری دادەنێن.**

(چیشتخانەی کوردەواری سیتی ئای)، ناوی ئەو چیشتخانەیە کە تایبەتە بە دروستکردنی چێشتی کوردەواری. لەم چیشتخانەیە دا رۆژانە زیاتر لە ١٢ جۆر خواردنی کوردەواریی بەدەستی خانمان دروست دەکرێت و پێشکەشی میوانەکان دەکرێت.

دەریا عەزیز، بەڕێوەبەری چێشتخانەی کوردەواریی سیتی ئای، بۆ (نەوژین) ئاماژەی بەوەکرد کە ئەوان وەکو کۆمەڵێک لەژنان وکچانی ناوچەی گەرمیان بەهاوکاری چەند هاورێیەک، بیرۆکەی ئەوەیان لادروست بو کە چێشتخانەیەکی کوردەواری لەگەرمییان بونی هەبێت کە ژنان وبەڕێوەی ببەن.

وتیشی: «خۆشبەختانە لە بەرواری ( ٢٠١٦/١٢/٢٥) چێشتخانەکەمان بە فەرمی کرایەوە بەروی میوانان و ماوەی زیاتر لە (٣) مانگە بەردەوامە» .

بەوتەی دەریا، سەرجەم کارمەند و ستافی چێشتخانەکەیان لە چێشتلێنەر و گارسۆن وکاپتنەکان، ژنن و هەر ئەوانیش کارەکانی چێشتخانەکە بەڕێوەدەبەن.

ئەگەرچی ژنان چێشتلێنەرێکی کارامەن، بەڵام سنوری چێشتلێنانەکەیان لە مەتبەخی ماڵەوە نەگواستۆتەوە بۆ مەتبەخی بازاڕ، بۆیە کردنەوەی چێشتخانەیەک کە ژنان کاری تێدا بکەن بەتایبەتی لەگەرمیان، تازەو تاڕادەیەکیش نامۆیە.

لەمبارەیەوە (دەریا عەزین) دەڵێت: «راستە ژنان ئەزمونێکی زوریان هەیە لە کاری بەڕێوبردنی مەتبەخ ودروستکردنی چێشت، بەڵام دروستکردنی چێشت بۆ چێشتخانەیەکی گشتی کە رۆژانە دەیان جۆر کەس و تەبیعەتی جیاواز دێنە میوانداریمان، پێشتر نەکراوەو کارێکی ئاسانیش نییە».

دەریا بە شانازیەکەوە ئاماژەی بەوەکرد کە سەرەتا روبەروی گرفتی زۆر بونەتەوەو کارەکەیان قورس بوە، بەڵام لەماوەیەکی کەمدا توانیویانە گرفتەکان تێبپەڕێنن.

ئەو هەستی شانازیەی لەلای دەریادا هەبو، لەلای زۆرینەی ئەو ستافەی چێشتخانەکەشدا رەنگی دابویەوە کەبینیمانن.

ژیان وەیس مراد، (٤٥) ساڵ، یەکێکە لە چیشتلێنەرەکانی چیشتخانەکە. بۆ (نەوژین) وتی: «ماوەی دو مانگە لێرە کاردەکەم، کاتی کارکردنم لە (٧) بەیانیەوە دەستپێدەکات تاوەکو (٧) شەو، رۆژی واهەیە (١٥) جۆر خواردنی کوردەواری یان زیاتر دروست دەکەم».

وتیشی: «راستە ماندو ئەبم، بەڵام دەستخۆشی میوانەکان و خەڵکی دەوروبەرم ئەو ماندوێتیەم بیر دەباتەوە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی زۆر خۆشحاڵم بە کارەکەم و سەربەرزم کە بە رەنجی شانی خۆم بژێوی ژیانم پەیدا دەکەم».

بەردەوام ژنان کەدەیانەوێت لە دەرەوە کاربکەن، روبەروی توانج و تێڕوانینی کۆمەڵ دەبنەوە، بەڵام ئەو ئافرەتانەی لە چێشتخانەکەدا دەستیان بەکار کردوە، باسلەوەدەکەن کە رێگەیان نەداوە قسەو قسەڵۆک تێکیان بشکێنێ و ساردیان بکاتەوە.

دەریا عەزیز، بەڕێوەبەری چێشتخانەی کوردەواریی سیتی ئای، لەوبارەوە وتی: «خەڵک بۆ هەمو کارێک ئەنجامی بدەیت قسە وتوانجت لێدەدات، ئیمەش تا گوێ بە قسەی خەڵک بدەین سەرجەم خەون و ئارەزوکانمان لە گۆڕ دەنێین».

وتیشی: «رێگری بۆ کارکردنی ژنان هەیە، بەڵام ئەگەر ژنان بتوانن خۆیان بسەلمێنن، بروا ناکەم رێگریەکانیش هێندە کاریگەر بن».

(ژیان)یش، وتی: «ئافرەت زور هەیە حەز دەکات ئیش بکات، بەڵام لە ترسی قسە و توانجی خەڵک ناوێرن بێنە مەیدانی کارکردنەوە، یەکێک لەوانە خۆم بوم کەدەردەچوم بۆ کارەکەم قسەی زۆرم هاتە سەر، بەڵام توانیم بەسەر ئەو ئاستەنگانەدا زاڵبم و دەوروبەرەکەشم دڵنیا بکەمەوە، هەربۆیە ئێستا دەستخۆشیم لێدەکەن».

هەندێک لە کارمەندەکانی چێشتخانەکە، کەسانی خاوەن بڕوانامەو دەرچوی زانکۆ و پەیمانگان. یەکێک لەوانە، (ئیڤان سەرتیپ)ە.

ئەو کە خاوەنی بڕوانامەی دبلۆمی ژمێریاریە، دەڵێت: «ماوەی دو ساڵە خوێندنم تەواو کردوە، بەڵام هیچ دامەزراندنێک نیە لە حوکمەت دا، بۆیە رومان لەکەرتی تایبەت کردوە».

وتیشی: «ماوەی سێ مانگە لێرە وەکو کاپتن کار دەکەم، ئیشەکەم زۆر بەدڵە و ئاسودەم پێی، چونکە هەمو کارمەندەکانی ئێرە ئافرەتن».

لەبارەی هەڵوێست و مامەڵەی خەڵکی بەتایبەت سەردانکەرانەوە، ئیڤان وتی: «هەڵسوکەوتی کەسانی دەوروبەرمان زۆر باشە و دەستخۆشییەکی زۆرمان بۆ دێت، ئەمەش جێگای دڵخوشییەو هانمان دەدات زیاتر گرنگی بە کارەکانمان بدەین و بەردەوام بین.»

هەرچەندە چیشتخانەکە ماوەیەکی کەمە کراوەتەوە، بەڵام ناوبانگێکی باشی لەناوچەکە دەرکردوە، زۆرێکیش لە کچان سەردانی دەکەن.

زریان پشتوان، کە خوێندکاری پەیمانگایە، ناوەناو سەردانی چێشتخانەکە دەکات. بۆ (نەوژین) وتی: «زۆرم پێخوشە کە هەمو کارمەندەکانی ئێرە ئافرەتن، هیچ جیاوازیەکیش نابینم لە ئیشی گارسۆنی یان چیشتلێنەری ئافرەت و پیاو، بگرە پێموایە ئافرەتان سەرکەوتو ترن، ئەوەتا ئەم چێشتخانەیە کە ژنان بەڕێوەی دەبەن خواردنی خۆش و پاکە و کەشەکەشی خۆش و گونجاوە».

بەڕێوەبەری چێشتخانەکەش وتی: «تا دێت رێژەی میوان و سەردانکەرانمان لە زیادبووندایە و لە هەمو تەمەنەکان چ گەنجان چ خێزاندارەکان و فەرمانبەر و کاسب و خوێندکار، سەردانمان دەکەن.»



# دو هاوسەری پێشمەرگە



■ نەوژین
زریان محەمەد — جوانە جەلیل

**پێکەوە لەبەرزاییەکانی گوبەیبەی ڕۆژئاوای کەرکوکەوە چاودێری ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی داعش و جموجۆڵی چەکدارەکانی ئەو ڕێکخراوەیان دەکرد، تەنها خەمی ئەو دو هاوسەرە پاراستنی سەنگەرەکانی پێشمەرگە بو لە هێرشی لەناکاوی داعش.**

(هەڵۆ ڕەمشتی) و (زوهرە هەورامی)، ئەو دو پێشمەرگەیەی پارتی ئازادی کوردستانن، کە چەند ساڵێک لەمەوبەر لە نێو سەنگەرەکاندا بریاری پێکهێنانی ژیانی هاوسەریان دا و هەر لەنێو سەنگەرەکانیشدا ژیانێکی ئاسایی پێکەوە بەسەر دەبەن.

هەڵۆ و زوهرە هەردوکیان فەرماندەی سەربازین لەریزی هێزەکانی پارتی ئازادی دا، زۆرجار پێکەوە بەشداری شەڕەکانیان کردوە، بە تایبەت کە لە هێرشەکەی ساڵی رابردوی پێشمەرگەدا بۆ سەر گوندی گوبەیبەی ڕۆژئاوای کەرکوک، هەڵۆ بەهۆی تەقینەوەی بۆمبی چێنراوەوە دەستێکی لەدەستداوە.

درەنگانێکی ئێوارە هەڵۆ و زوهرە کە جلی سەربازیان لەبەردابو ، پێکەوە بەدوربین چاودێری چەکدارەکانی داعشیان دەکرد، زوهرە بەدەم هەڵکردنی دوربینەوە بۆ (نەوژین) دواو، وتی: «ژیانی شاخ و پێشمەرگایەتیم زۆر لە ژیانی شار لا خۆشترە، چونکە خەمی من پاراستنی خاکی کوردستانە لە هێرشی داگیرکەران.»

گەر لەرابردودا کچان و ژنان خۆیان لەبەشداری کردنی شەڕ بواردبێت و لێی ترسا بن، ئەوا بەشداری کردنی شەڕ لەلایەن ژنانەوە لەریزی حیزبە کوردیەکاندا بەتایبەت لەچەند ساڵی رابردودا، سیحری شەڕی لای ژنان بەتاڵکردەوە.

هێزەکانی پارتی ئازادی کوردستان کە هێزێکی ئۆپۆزسیۆنی ئێرانین، بەشداریان لەشەڕی دژ بەداعش کردوە و لەئێستادا هێزەکانیان لەباشیک و رۆژئاوای کەرکوک جێگیرکردوە، کە کچان و ژنان ژمارەیەکی بەرچاو لەهێزەکانیان پێکدەهێنن.

دوا شەهیدی ژن لە ریزەکانی پارتی ئازادی دا، شەهید بونی کچە پێشمەرگەیەک بو، کەدوای بریندار بونی لەرۆژی ٢/٢٦ بە هاوەنی داعش لەباشیک و مانەوەی بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێک گیانی لەدەستدا.

(زوهرە هەورامی) کە وەکو فەرماندەیەکی سەربازی دەردەکەوت و سەرپەرشتی پێشمەرگە ژنەکانی حیزبەکەی دەکرد، باسیلەوەکرد لە زۆربەی شەڕەکاندا لەگەڵ هەڵۆی هاوسەریدا پێکەوە بەشدارن بەتایبەت لەکاتی هێرشەکانی ئەم دواییەدا بۆ سەر چەکدارەکانی داعش. وتی: «زۆرجار هەڵۆ لەدەستەی هێرش بردنە، منیش لەو دەستەیەم کە بەدوای هەڵۆدا هێرش دەکەینە سەر ئامانجە بۆ دیاریکراوەکانمان.»

> **دوای برینداربونم و لەدەستدانی دەستێکم، زوهرە هەمیشە هاوکارمە**

هەڵۆی هاوسەری زوهرە کە شارەزای بواری پوچەڵکردنەوەی بۆمبی چێنراویشە، ساڵی رابردودا لەکاتی کۆنترۆڵکردنەوەی گوندی گوبەیبەی رۆژئاوای کەرکوکدا بۆمبێک پێیدا تەقیەوە و دەستێکی لەدەستدا.

زوهرە وتی: «ئەو رۆژەی هەڵۆ برینداربو، من لە پرسە بوم، کاتێک هەواڵی برینداربونی هەڵۆم بیست ئۆقرەم لێبڕاو خۆم گەیاندە لای.»

هەڵۆ و زوهرە جیاواز لەو هاوسەرانەی کە لەشار و شارۆچکەکاندا ژیان بەسەر دەبەن و هەمیشە بیریان لای بەخێوکردنی ماڵ و منداڵە، ئەوان هەمیشە بیریان لای پاراستنی سەنگەرەکان و بەرپەرچدانەوەی هێرشەکانی داعشە.

ئەو دو هاوسەرە لەنێو خانویەکی سادەی بەچینکۆ سەر داپۆشراوی نێو سەنگەرەکاندا ژیان بەسەر دەبەن، هەمیشە پابەندن بە جێبەجێکردنی رێو شوێنی سەربازی و پێکەوە ئەرکە سەربازیەکانیان رادەپەرێنن.

هەڵۆ رەمشتی، وتی: «دوای برینداربونم و لەدەستدانی دەستێکم، زوهرە هەمیشە هاوکارمە لە ئیشوکاری ماڵەوە و جێبەجێکردنی ئەرکە سەربازیەکانیشمدا.»

# تاکە ئافرەتە بەڕێوەبەرەکەی کفری

■ نەوژین، ئومێد زەنگەنە

**لەکەرتێکدا کەسەرجەم ئەوانەی تیایدا بەرپرس و دەستڕۆیشتون لە رەگەزی نێرن، ئافرەتێک بەتەنیا توانیویەتی جێگای خۆی بکاتەوە، ئەو ماوەی سێ ساڵ و نیوە وەکو بەڕێوەبەری بەڕێوەبەرایەتی گەشتوگوزاری کفری کاردەکات و بەردەوامە لە ئەرکەکەی. حەمدیە مەنسور، تاکە ئافرەتە لەنێو هەمو سلکی بەڕێوەبەرانی حکومیی دا لە قەزای کفری، باس لەئەزمونی خۆی و بەرەوپێشەوەچونەکانی دەکات.**

سەرەتا لەخۆناسندنیەوە دەستپێدەکات و دەڵێت: «ناوم حەمدیە مەنسورە، دانیشتوی قەزای کفریم و خاوەنی دو بڕوانامەم لەبواری ئەندازیاری کشتوکاڵی و دبلۆم لە دەرمانسازی».

لەبارەی ئەو رێگریانەی کە لەماوەی کارکردندا روبەڕوی بوەتەوە، حەمدیە دەڵێت: «بێگومان توشی چەندین کێشەوگرفت بومەتەوە بەو پێیەی بەشێک لەکۆمەڵگا و فەرمانگەکان توانای قبوڵکردنی ئەو واقیعەیان نەبوە کە ئافرەتێک ببێت بە بەڕێوبەری بەڕێوەبەرایەتیەک بەتایبەت لەشاری کفریدا کە تا ڕادەیەکی زۆر گۆمەڵگایەکی داخراوی هەیە، بەڵام دەبێت ئافرەت لەبارودۆخێکی وەهادا خۆی بسەلمێنێت سەرەتا بۆ خێزانەکەی دواتر بۆ کۆمەڵگاکەی ئینجا بۆ ئەو دەزگایەی کاری تێدادەکات بەوەی تاچەند بەتوانا و باوەڕپێکراوە».

جەختیشیکردەوە: «ئافرەت هەرچەندە کەسایەتی بەهێز بێت و متمانەپێکراو بێت، ئەوەندە زیاتر دەتوانێت رێز بۆخۆی و ئافرەتانی دیکەش دروستبکات و گەیەنەری پەیامی جیاواز نەبونی ئافرەتان و پیاوان بێت و رێگاخۆشکەر بێت بۆئافرەتانی دیکەش کە بتوانن هاوشێوەی ئەو بەرەوپێشەوە بچن».

لەبارەی گرنگیی کارکردنی ئافرەتان هاوشێوەی پیاوان لە دەرەوە و تێکەڵ بون بەکار و هاتنە دەرەوەیان لە چوارگۆشەی داخراوی کۆمەڵگا، حەمدیە، دەڵێت: «کەسایەتی ئەو کەسە رۆڵ دەبینێت بەوەی تاچەند بە ئاگاییەوە روبەڕوی ئەو کێشەو گرفتانە دەبێتەوە کەدێنە رێگای». وتیشی: «خۆشبەختانە زۆرێک لەفەرمانگەکان هاوکارم بونە لەکاروبارەکانم دا بەتایبەت کاتێک کە دەبینن کارەکانم بەبێ کەموکورتی ئەنجام دەدەم».

یەکێک لەو خاڵانەی کە ئەم ئافرەتە بەڕێوەبەرە بەگرنگیی دەزانێت بۆ ئافرەتان، بەهێزکردنی لایەنی خودیی و زانینی توانا تایبەتیەکانی خودە. لەوبارەوە دەڵێت: «پێویستە ئافرەت پێش ئەوەی لە خێزانێکی داخراو لەکۆمەڵگایەکی داخراو بێتە دەرەوە، دەبێت کار لەسەر خۆی بکات بەوەی دەبێت بزانێت تاچەند توانای هەیە و شایەنی ئەو جێگایەیە کە کاری تێدا دەکات، هەروەک دەبێت کاربکات لەسەر هۆشیاری و رۆشنبیری خۆی و پاراستنی کەسایەتی خۆی». بەهۆشیاریشەوە ئاماژە بەوەدەدات کە «هەندێک نەریت هەیە کەنابێت ببەزێنرێت، چونکە چەندین رێگای دیکە هەیە کە دەتوانیت بەجوانی و بەسەربەرزیەوە خۆتی لێوە بسەلمێنیت».



حەمدیە مەنسور، لەبارەی رێگریەکانی خێزانەکەیەوە دەدوێت و دەڵێت: «خێزانەکەم نەک هەر رێگرم نەبون، بەڵکو خۆشبەختانە زۆرهاوکارم بونە و پشتیوانی تەواوی کاروبارەکانم بون بەوەی کە متمانەی تەواویان بە من هەبوە، بەدڵنیایشەوە ئەو متمانەیە دەستی هەمو ئافرەتێک ناکەوێت، بۆیە هەمیشە شانازی بەخێزانەکەمەوە دەکەم».

پێش دەستبەکاربونی وەک بەڕێوبەری گەشتوگوزاری کفری، (حەمدیە) بەرپرسی یەکێک لەبەشەکانی کارگەی دروستکردنی دەرمان بوە لەشاری (سامەڕا)، لەئێستاشدا لەشاری کفری خاوەنی دەرمانخانەیەکی تایبەت بەخۆیەتی کەوەک خۆی دەڵێت یەکەم ئافرەت بوە دەرمانخانەی لەشاری کفری دا کردوەتەوە و ئێستاش دەرمانخانەکەی ئەو تاکە دەرمانخانەیە کەزیاتر تایبەت بێت بەئافرەتان و هاوکات تاکە دەرمانخانەشە نەک هەر لەسنوری قەزای کفری، بەڵکو لەتەواوی گەرمیانیشدا کە ئافرەتێک بەڕێوەی ببات.

لەبارەی ئەو پرۆژە و کار و چالاکیانەی کە لەماوەی کارکردنیدا وەک بەڕێوبەری گەشتوگوزاری کفری هەوڵی بۆداوە و بەئەنجامی گەیاندوە، (حەمدیە) وتی: «لەماوەی رابردودا هەوڵمانداوە گەشتوگوزاری کفری بەناوچەکانی دەوروبەر و کۆمپانیا گەشتیاریەکان بناسێنین و لە رێگای کۆمپانیاکانیشەوە کفری وەک ناوچەیەکی گەشتیاری بەهەمو جیهان بناسێنین، هەروەها توانیومانە ماستەر پلانی گەشتیاری کفری پێش ماستەر پلانی هەمو گەرمیان ئامادەبکەین و لەهەوڵی ئەوەداین کە خزمەتگوزاری بۆ ناوچە گەشتیاریەکانی کفری دابین بکەین بێگومان هەمو ئەمانەش بە هاوکاری و پاڵپشتی ستافەکەم و فەرمانگە پەیوەندیدارەکانی دیکە بوە».

حەمدیە، وەک ئافرەتیکی خاوەن ئەزمون لەکارکردنی دەرەوەدا، پەیامێک بەگوێی ئافرەتان دا دەدات و دەڵێت: «تکا لەئافرەتان دەکەم لەکۆمەڵگادا وەک کەسایەتیەکی بەهێز و کاریگەر خۆیان ببینن نەک بەو تێڕوانینەی کۆمەڵ بۆ ئافرەت دروستی کردوە بەوەی خۆیان بەلاواز سەیرکەن».



# کچانی گەرمیان دەگەڕێنەوە سەر تەختەی شانۆ

■ نەوژین
سەرگوڵ خەلیل – بێریڤان محەمەد

**ئەگەرچی ژمارەی ئەو ژنانەی لە بواری شانۆ دا لەگەرمیان کار دەکەن کەم و سنوردارن، بەڵام سەرباری ئەوەش ژنانێک هەن کە لەخۆبوردوانە لەو مەیدانەدا کاردەکەن، بەڕێوەبەری ڕۆشنبیری گەرمیانیش، بەشداریی ژنان لە شانۆدا بەکاریگەر دەزانێت.**

شانۆ، یەکێکە لە دێرینترین ئەو شێوازانەی هونەر کە لەگەرمیان دا کاری لەسەر کراوە، بەڵام هەر لەکۆنەوە تائێستا یەکێک لە دیارترین کێشەکانی شانۆ، کەمی بەشداری ژنان بوە تیایدا.

پێشتر و لەرابردودا، زۆرجار بۆ ڕۆڵی کاراکتەری ژنان لە شانۆکاندا، بەهۆی نەبونی ژنی ئەکتەرەوە، ناچار ئەو ڕۆڵەش هەر بە پیاوان دەدرا، ئێستا ئەگەرچی بەوشێوەیەی ئێستا نەماوە، بەڵام هێشتا بەشداریی ژنان زۆر و بەرفراوان نیە.

شەیما مەحمود، یەکێکە لەکچانی شانۆکاری گەرمیان کە ماوەی چەند ساڵێکەو هاوشان لەگەڵ خوێندنی لە پەیمانگای هونەرەجوانەکان، چونە سەر تەختەی شانۆی ئەزمون کردوە.

بۆ (نەوژین) وت: وتی: «کارکردن لەشانۆ دا بەتایبەت لەگەرمیان زۆر داخراوە بەروی ئافرەتاندا و کارێکی زەحمەتە».

ئەو کچە پێیوایە کە بەشێک لە هۆکارەکانی بەشدارییەنەکردنی کچان لەشانۆ دا، بۆ بونی ڕێگری کۆمەڵایەتیی و لایەنی کلتوریی دەگەڕێتەوە. ئەم بۆچونە دەرهێنەرێکیش جەختی لێدەکاتەوە.

عومەر عەبدوڵڵا، بەڕێوبەر و دەرهێنەری گروپی شانۆی ئەستێرەکان، بە (نەوژین)ی وت: «کلتور و کۆمەڵگای ئەم ناوچەیە وایکردوە ئافرەتان کەمتر بێنە دنیای شانۆوەو بەشی شانۆ هەڵبژێرن.»

ئاماژەی بەوەشکرد: لەئێستادا دەرفەتی کارکردن لە شانۆدا بۆ کچان زیاترەو ئەوانیش دەتوانن پەرەی زیاتر بە کارەکانیان بدەن.

وتیشی: « کچان هەستیان باشترە لەکوڕان و زوتر هەست بە شتەکان ئەکەن، بۆیە ئەتوانن باشتر لەسەر تەختەی شانۆ بەرجەستەی ڕۆڵەکانیان بکەن».

ئەگەرچی لە دەڤەرەکەدا لە بری یەک پەیمانگا، دو پەیمانگای هونەرەجوانەکان هەیە لەکفری و خانەقین، کەچی هێشتا بونی ئەکتەری ژن بەشی پێویست لەدەڤەرەکە بەرەوپێشەوە نەچوە.

بە رای کچێکی شانۆکار، هۆکاری ئەمەش بۆ ئەوەدەگەڕێتەوە کە زۆرێک لەو کچانەی دەچنە ئەو پەیمانگایانە، بڕوانامەیان لاگرنگترە هەتاوەکو کارکردن لە هونەر.

ناسکە محەمەد، کچە شانۆکارێکی کەلارە، بۆ (نەوژین) وتی: «کچان و ژنان لە گەرمیاندا بەشێوەیەکی زۆر کەم رو لەبوارەکانی شانۆ ئەکەن و هەندێکیان تەنها بۆ بەدەستهێنانی بڕوانامە دەچنە پەیمانگا و کۆلێژ و خوێندنی ئەکادیمی تەواو دەکەن».

هەمیشە کارکردنی ژنان لە هونەردا لەگەرمیان و بەتایبەت شانۆ، وەکو کارێکی مەترسیدار وێناکراوە، هەر ئەمەشە وایکردوە کچان کەمتر جورئەتی بەشدارییکردن بکەن لەو کایەیەدا.

بەڵام ئەو کچانەی کەلەشانۆ دا کاردەکەن، بەپێچەوانەوە باسلەوەدەکەن کە ئەگەر کچان متمانەیان بەخۆیان هەبێت، ئەوا سەرکەوتو دەبن.

شەیما مەحمود، لەوبارەوە نمونەی خۆی هێنایەوە کەتائێستا روبەروی هیچ گرفتێک نەبوەتەوە «من لەماوەی کارکردنمدا روبەروی هیچ کێشە و گیروگرفتێک نەبومەتەوە و خێزانەکەشم زۆر هاوکار و پاڵپشتم بون».

(ناسکە)ش ئاماژەی بەوەکرد: «من بەشێوەیەکی ئەکادیمی نەچومەتە نێو بوارەکەوە، بەڵکو بەحەزی خۆم دەستم بەکار کردوەو هاوسەرەکەشم زۆر هاوکار و پشتیوانمە».

بەڕێوەبەری گشتی ڕۆشنبیری و هونەری گەرمیانیش باسلەوەدەکات کە سەرباری بەشدارییەکان، بەڵام بەشداریی ژنان لە هونەردا، لەئاست خواستی ئەواندا نییە.

ئاکۆ یوسف (ئاکۆ هۆرێنی)، بەڕێوبەری گشتی ڕۆشنبیری و هونەری گەرمیان، بۆ (نەوژین) وتی: «بەشداری ژنان لە چالاکی شانۆدا بونی هەیە و مایەی خۆشحاڵیە، بەڵام بەبەراورد بە پیاوان ژنی شانۆکارمان کەمەو لە ئاستی تموحی ئێمەدا نییە».

ئەو بەڕێوەبەرە، پێیوایە پرسەکە پێویستی بە گرۆتینی نوێتر و زیاتر هەیە لە لایەن ژنان خۆیانەوە بە پلەی یەکەم و هەروەها لەلایەن دامودەزگا و گروپە پەیوەندیدارەکانەوە.

وتیشی: «پێویستە کاری زیاتر بکرێت بۆ هاتنە مەیدانی ژنان لە کایەی هونەری بەگشتی و شانۆ بەتایبەتی، من دڵنیام ژنان و کچانی خاوەن بەهرەو بەتوانامان زۆرە، بەڵام هۆکار و واقیعە کۆمەڵایەتی و کلتورە باوەکانمان کاریگەریان هەبوە بۆ ڕێگریکردن لە دەرخستنی ئەو بەهرەو توانایانە».

( شەیما ) ش ، بە پێداگیرییەوە دەیوت: «ئێمە نابێ گوێ بۆ قسەو قسەلۆک بگرین، بەڵکو دەبێت سوربین لەسەر کارکردن بۆ پەرەدان بەتواناو بەدیهێنانی ئامانجەکانمان».

شکسپیری ئەدەبی سۆمەری ...

# یەکەمین ژنە نوسەر لە مێژودا



■ نەوژین

**پێتان سەیر نەبێت کاتێک بزانن یەکەمین ژنە نوسەر کەمێژو ناسیبێتی، لەم شوێن و وڵاتەدا بوە کە ئێمەی ئێستا تیایدا دەژین، ئەو بەو بەیتە شیعری و سرودە ئاینییانەی کەنوسیەیەتی، ناوی وەکو یەکەمین نوسەر لەسەر بەردی مێژو هەڵکۆڵیوە.**

ئەنخیدوانا، ئەو ژنە نوسەرەی شارستانیەتی وڵاتی نێوان دو روبار «میزۆپۆتامیا»یە کە وەکو یەکەمین ژنی نوسەر لەمێژودا ناوی هاتوە، هەندێکیش بە «شکسپیری سۆمەری» ناویان بردوە.

ئەم ژنە، کچی پاشای ئەکەدی سەرجۆن بوە، بەڵام جیاوازی لەوانی تر ئەوەبوە کە خولیاو توانایەکی باشی بۆ نوسین و هۆنینەوەی شیعر و قوڵبونەوە لەبابەتە ئاینییەکانی ئەو سەردەمەدا هەبوەو بەپلەیەک گەیشتوە کە بەگوێرەی بیروباوەڕی ئەوکات، نزیک بوە لەوەی ببێت بە «خواوەند».

ئەنخیدوانا، لەسەروبەندی بابلیی کۆن و ساڵانی ٢٢٨٥-٢٢٥٠ پێش زاین ژیاوە، بەوهۆیەی خاوەنی کاریزماو کەسێتییەکی تایبەت بوە، بۆیە لەلایەن باوکیشییەوە گرنگیی زیاتری پێدراوەو کراوە بە کاهینی گرنگترین پەرستگای سۆمەریەکان لە ئۆر، ئەگەرچی هەندێکی دیکە بەگومانن لەوەی کچی سەرجۆن بێت، بەڵکو پێیانوایە کە بەهۆی ئەو کارێزمایەوە، سەرجۆن کردویەتی بەکاهین.

لەمیانی کنەوپشکنینە شوێنەواریەکان دا، توانراوە سەدان پارچە لە دەستنوس و نوسراوەکانی ئەم ژنە نوسەرە بدۆزرێتەوە، کە دوای پشکنینی و لیکۆڵینەوەیەکی زۆری توێژەران، گەیشتنە ئەو باوەڕەی کە ئەو ژنە یەکەم ژنی نوسەرە لەمێژودا.

ویلیام ولفگانک، پرۆفیسۆری پسپۆڕ لە ئەدەبی ئاشوری و بابلی لە زانکۆی یال، باسلەوەدەکات کەزۆرێک لە نوسەرەکانی ئەو سەردەمە، تەنها نوسەرەوە بون نەک نوسەر، بەو واتایەی کە نوسینی ئاینی و بابەتی دیکەیان لەسەر تەختەو تابلۆی قوڕ نوسیوەتەوە، بەڵام (ئەنخیدوانا) لەوانە بوە کەخۆی شتی داهێناوەو نوسیوە.

ئەو پرۆفیسۆرە، پاش خوێندنەوەی بەرهەمەکانی، نازناوی «شکسپیری ئەدەبی سۆمەری» بەم ژنە نوسەرە داوە، ئەویش بەهۆی جۆری نوسینەکەیەوە، کەبەرای ئەو بەهۆی بەپێزییەوە، هەتا دوای سەدان ساڵیش وەکو سەرچاوەو بابەتی گرنگ خوێندراوەتەوە.

ئاماژەی بەوەشکردوە کە نوسینەکانی ئەو ژنە بریتیی بوە لە هۆنراوەو سرودی ئاینی و وێرد و چیرۆک و دەقی لاهوتی و مێژویی.

ئەنخیدوانا، توانیویەتی بۆماوەی زیاتر لە ٤٠ ساڵ وەکو کاهینێکی ژنی باڵا، پارێزگاری لە ڕۆڵە کاریگەرەکەی بکات و لەکارکردن و نوسین نەوەستاوە تا کۆچی دوایی لە سەردەمی (نرام سین)ی برازای دا.

ئەگەرچی زیاتر لە ١٠٠ پارچە قوڕی نوسینی دۆزراوەتەوە، بەڵام تائێستا گۆڕی (ئەنخیدوانا) دیار نییەو نەدۆزراوەتەوە. توێژەرێکیش پێیوایە رەنگە گفتوگۆ و مشتومڕ لەبارەی خۆی و نوسینەکانیەوە بەردەوام بێت، هاوشێوەی ئەو مشتومڕەی لەسەر (شکسپیر) دەکرێت.



# مناڵانی سەر زبڵدانەکان

## لەسەر پاشماوەی خەڵکی بژێوی خێزانەکانیان پەیدا دەکەن



▪ نەوژین، ئەیاد محەمەد

**(یاسر) بە نێو زبڵ و خۆڵ و خاشاکدا دەسوڕایەوە و بەدەم وەشاندنی تێلەکەی دەستیەوە، بەوردی دیقەتی دەدا و بەدوای فافۆن و کەرەستەی فرێدراودا دەگەڕا تا بیفرۆشێت و ژەمە خۆراکێکی بۆ خوشک و براکانی پێ بکڕێت.**

(یاسر) کوڕە گەورەی خێزانێکی دەستنەڕۆ و دەستکورتی ئاوارەی جەلەولایە و ئێستا لەخانویەکی کرێی ناحیەی رزگاری دا ژیان بەسەر دەبات، کە رۆژانە ١٢ کاتژمێر بەنێو زبڵ و خۆڵ و خاشاکدا دەسوڕێتەوە، لەو رێگەیەوە کرێ خانو و بژێوی دو براو خوشکە بچوکەکەی پەیدا دەکات.

یاسر حەمید، تەمەنی ٨ ساڵ بو، کاتێک باوکی کۆچی دوایی کرد، سەختی ژیان خۆشیەکانی مناڵی لێسەندەوە و بە پەیدا کردنی بژێویەوە سەرقاڵی کرد، ئەو راکەراکە و دەستنەرۆیی بەو تەمەنە کەمەوە بەشێوەیەک ماندوی کردبو، تارمایی ماندوێتی روخساری داپۆشیبو.

(یاسر) بەدەم کۆکردنەوەی قوتوە بیبسیەوە بۆ (نەوژین) دواو ، وتی: «باوکم بەهۆی لێدانی دەرزی هەڵەوە جێی هێشتین، لەو کاتەوە من کاردەکەم و دایک و دو براو خوشکە بچوکەکەم بەخێو دەکەم.»

کۆنترۆڵکردنی ناحیەی جەلەولا لەلایەن داعش و ئاوارەبونی دانیشتوانەکەی، هێندەی تر باری سەرشانی یاسری قورستر کرد، بە تایبەت لەسەری پێویست بو مانگانە دوسەد هەزار دیناریش بۆ کرێی ئەو خانوە پەیدا بکات کە دوای ئاوارەبون تێیچوە.

یاسر رۆژانە لە کاتژمێر ٦ ی بەیانی لەماڵ دەردەچێت و رو دەکاتە پشت گوندی دێبنە، ئەو جێگەیەی کە ئۆتۆمبێلەکانی شارەوانی بۆ فرێدانی زبڵ و خۆڵ و خاشاک رویلێدەکەن، تا (٦) ی ئێوارە بەنێو ئەو زبڵەدا دەسوڕێتەوە و قوتوە کۆنە و شتی فرێدراوی ماڵان کۆدەکاتەوە.

یاسر، ئاماژەی بەوەشکرد ئەو قوتوە کۆنە و فافۆن و شتە بەکارهاتوانەی لەنێو زبڵدا دەیاندۆزێتەوە، دەمەو ئێوارە بەماتۆر سکیل دەیانبات بۆ فرۆشتن. وتی: «رۆژانە ٥ بۆ ١٠ هەزار دینار پەیدا دەکەم، لەو پارەیە خۆراک و پێداویستی دەکڕم و دەچمەوە بۆ لای دایک و دو براو خوشکە مناڵەکەم.»

لەیاسای عێراقی دا خواروی تەمەن ١٨ ساڵ بە مناڵ هەژمار کراوە، بەپێی یاسا کارکردنی قورس بە مناڵ سەرپێچیە، بەڵام خراپی دۆخی ئابوری خێزانەکان هەزاران مناڵی فرێداوەتە سەر شەقامەکان و جێبەجێکردنی یاساکانیشی راگرتوە.

ئەو زبڵ و خۆڵ و خاشاکە بۆگەن کردوەی کە رۆژانە یاسر و چەندین مناڵی تر کاتەکانیانی تێدا بەسەر دەبەن، نەک تەنها کاریگەری دەرونی، بەڵکو زیان بە لایەنی تەندروستی ئەو مناڵانەش دەگەیەنێت.

لەیلا ئەحمەد، ئەندامی تیمی رێکخراوی وادی ئەڵمانی بۆ بەدواداچونی کێشەکانی ژنان و مناڵان، بە (نەوژین)ی وت: «زۆربەی ئەو مناڵانەی کاردەکەن ئەوانەن کە باوکیان لەژیان دا نەماوە یاخود نەخۆشن.»

وتیشی: «دەستکورتی و دەستنەرۆیی هۆکاری کارکردنی مناڵانە.»

بەپێی راپۆرتی ساڵانەی رێکخراوە نێودەوڵەتیەکانیش، عێراق بەهەرێمی کوردستانەوە یەکێکە لەو وڵاتانەی کە تێیاندا توندوتیژی بەرانبەر بە مناڵان ئەنجام دەدرێت، هەروەک مناڵانیش کاریان پێدەکرێت کە هەندێکجار کارەکان قورسن و لە توانای ئەوان زیاترە.

خەبات رەشید، بەرێوەبەری نوسینگەی مافی مرۆڤی گەرمیان، بە (نەوژین)ی وت: «رێژەی کارکردن بەمناڵان لەگەرمیان لەهەڵکشاندایە و ئەمساڵ بەراورد بەساڵانی رابردو، ژمارەی ئەو مناڵانە زیادیکردوە کە کار دەکەن.»

# چۆن رێگری لە درۆکردنی مناڵەکانمان بکەین؟

▪ نەوژین

**زۆرێک لە خێزانەکان روبەڕوی حاڵەتی درۆکردنی مناڵەکانیان دەبنەوە، ئەمەش کێشەیەکە کەدەبێت هەر بەزویی هەنگاو بۆ چارەسەرکردنی بنرێت، بۆ ئەوەی مناڵەکە پێی رانەیەت و خوی پێوەنەگرێت و لەگەڵ تەمەنی دا هەڵنەکشێت و پەرەبسێنێت، کە لێکەوتەو کاریگەریی خراپ و وێرانکەری دەبێت بۆسەر دەرون و کەسایەتی مناڵ و خێزانەکەشی.**



پێش ئەوەی بپرسین چۆن؟ ئەبێت بپرسین بۆ؟ واتا پێش ئەوەی باسی چارەسەر بکەین، ئەبێت باسی هۆکار بکەین. بۆچی مناڵان درۆ دەکەن یان پەنا بۆ درۆکردن دەبەن؟

لەم خاڵانەدا کۆی وەڵامەکان کورت دەکەینەوە:

١. زۆرینەی جار درۆکردن لەمناڵان بەتایبەت خوار ٥ ساڵان، پەیوەندیی هەیە بە بەپیتی خەیاڵی مناڵەکەوە، کەوادەکات زۆرجار ئەوەی لەخەیاڵی دایە لەگەڵ واقیع دا لێی تێکەڵ ببێت.

٢. رەنگە مناڵ بەهۆی هەست بەکەموکورتیی کردن یان بۆ بەدەستهێنانی هەندێک شت، پەنا بۆ درۆکردن ببات.

٣. رەنگە هەندێکجار درۆکردن بۆ تۆڵەکردنەوە بێت، ئەویش کاتێک مناڵ دەیەوێت تۆمەتێک لەسەر خۆی لابدات و بیداتە پاڵ یەکێکی تر، کە رەنگە ئەو دانە پاڵە بۆتۆڵەکردنەوە بێت.

٤. رەنگە لاسایی دایک و باوکی یان ئەو کەسانە بکاتەوە کە لێوەی نزیکن.

٥. رەنگە لەترسی سزادان مناڵان پەنا بۆ درۆکردن ببەن، چونکە لەکاتی تۆمەتبارکردن و ترسان لە سزاکان، هەوڵدەدات شتگەلێک دروست بکات بۆئەوەی لەرێگەیانەوە خۆی بپارێزێت لە سزادان.

٦. هەندێکجار مناڵ کاتێک لەلایەن دایک و باوکەوە بەشی پێویست گرنگیی پێنادرێت و ئیهمال دەکرێت، پەنا بۆ درۆکردن دەبات بۆ ئەوەی سەرنجیان رابکێشێت.

هۆکارەکانی درۆکردن هەرکام لەم خاڵانە بن، ئەوا دەبێت دایک و باوک بەزویی هەوڵی چارەسەر کردنی بدەن و هەنگاوەکانی دورخستنەوەی مناڵەکەیان لە درۆکردن دەستپێبکەن. باشترین هەنگاوەکانیش، لەم خاڵانەی خوارەوە کورت دەکەینەوە:

١. دایک و باوک دەبێت ببنە رابەرێکی باش بۆ مناڵەکانیان و خۆیان لە درۆکردن بەدور بگرن، بۆئەوەی مناڵەکانیان چاویان لێنەکەن. بۆنمونە جاری واهەیە تەلەفۆن بۆ دایک و باوک دێت کە لەماڵن، بەڵام دەڵێن لەماڵ نین و لە دەرەوەین، کە مناڵ ئەم درۆیە دەبیستێت، ئەویش درۆکردنی لەلا ئاسایی دەبێتەوە.

٢. دەبێت بپرسین و بزانین مناڵ بۆ درۆ دەکات؟ هۆکارەکەی چییە؟ واتا کام لەو شەش هۆکارەیە کە ئاماژەمان پێدا؟ بەدیارییکردنی هۆکارەکەی، چارەسەرەکەشی ئاسان دەبێت، چونکە هەریەکە لەو هۆکارانە، شێوازی مامەڵەکردنی تایبەت و گونجاوی خۆی هەیە.

٣. ئەو مناڵانەی کەخەیاڵیان فراوان و بەپیتە، پێویستە دایک و باوک بەتایبەتی دایک، بەشدار بێت لە وێناکردنی خەیاڵەکانی و لەوبارەوە قسەی لەگەڵ بکات، ئەمەش وادەکات مناڵ دوربکەوێتەوە لە بەکارهێنانی ئەو خەیاڵاتانە بۆ درۆکردن.

٤. دەبێت دایکان و باوکان بۆچارەسەرکردنی ئەم حاڵەتە، بەهیچ شێوەیەک بیر لە لێدان و توندوتیژی نەکەنەوە، چونکە ئەم کارە وادەکات مناڵەکە هەڵوێستێکی نەرێنی وەربگرێت و درۆکردن لە نەستی دا بەهێز دەکات. بەڵکو دەبێت بەپێچەوانەوەو بەقسەی خۆش هانی مناڵان بدەن بۆ راستیی وتن و دورکەوتنەوە لە درۆکردن و پاداشتکردنی مناڵان لەکاتی وتنی راستی دا.

٥. هەندێکجار پێویست دەکات مناڵان لەسەر درۆکردنیان سزا بدرێن، بەڵام سزاکان دەبێت پەروەدەیی بن، واتا یاریی یان شتێکی دڵخوازی خۆیان لێ قەدەغە بکرێت، بۆئەوەی جارێکی دیکە بیر لە درۆکردن نەکەنەوە، بەپێچەوانەشەوە دەتوانرێت لەکاتی وتنی راستیی دا خەڵات بکرێن وەک لەخاڵی پێشودا ئاماژەمان بۆ کرد.

سەرچاوە:
blogspot.com.raisingchildren123

# یاساکەی هەرێم لە دژی فرەژنی هیچی پێنەکرا!





▪ پارێزەر: نەشاد عومەر

**پرۆسەی فرەژنی و هێنانی ژنی دوەم ئەگەر لە هەرێم ڕێژەکەی زیادی کردبێت، ئەوا لە ناوچەی گەرمیاندا پرۆسەکە بوە بە دیاردەیەکی زۆر بەربڵاو و ئاشکرا، ئەگەر ئەنجامدانی گرێبەستی هێنانی ژنی دوەم و زیاتریش لە ناوچەکانی تری هەرێمەوە زەحمەت بێت بۆ پیاوان تا بگەنە دادگاکانی دەرەوەی ئیدارەی هەرێم، ئەوا بۆ پیاوانی ئەم ناوچەیە لە هەمو شتێک ئاسانترە و هیچ زەحمەتێکی تێدا نییە. ڕێژەی زۆری ئاوارەکان و هاتنی خێزانە عەرەبەکان بۆ ناوچەکەو بونی کچان و بێوەژنانێکی زۆر تێیانداو و ئەو داواکاریە زۆر کەمەی کە ئافرەتانی عەرەب هەیانە لە پیاوان و لێخۆشبونیان لە هەمو مافە دارایی و مادیەکانیان لە پیاوان، پرۆسەکەی هێندەی تر زیاد و ئاسان کردوە.**

پرۆسەی هێنانی ژنی دوەم لە دادگاکانی دەروەی دەسەڵاتی ئەنجومەنی دادوەری هەرێم، بە چەند شێوازێک ڕێگەپێدراوە، بەشێوەیەک کە دەکرێت لە هەرێم و لە دەرەوەی دادگا کەسێک ژنی دوەم بهێنێت و بە ئامادە کردنی دو شایەت لە یەکێک لە دادگاکانی باشور گرێبەستەکەی بکاتە یاسایی و لە ڕێگەی داوای (هاوسەرگیری دەرەکی)یەوە خۆی لە هەمو ترس و دڵەڕاوکێیەک رزگار بکات کە بێگومان ئەمە لە ڕێگەی بریکاریشەوە دەبێت، یان دەکرێت وەکو هەر گرێبەستێکی تری ئاسایی لەو دادگایانە گرێبەستەکەی ئەنجامبدات و تەنها ئەو چەند مەرجەی تێدا بێت کە یاسای عێراقی دایناوە ئەتوانێت ژنی دوەم و زیاتر بهێنێت.

مەرجەکانیش بونی پێویستییە بۆ ژنی دوەم و بەدیهێنانی عەدالەتە لە نێوانیاندا، گەرچی لێرەولەوێ هەوڵ و هەڵوێستی دژ ئەنرێت لەم دیاردەیە و وا پیشان ئەدرێت دیاردەیەکی نەویستراوە، بەڵام لە بەرئەوەی دیاردەکە لە پرۆسەیەکی تەواو یاسایی و شەرعیدا ئەنجام دەدرێت ئەوا هیچ لەو هەوڵانە نەک نەبونەتە هۆی کەمبونەوەی دیاردەکە، بگرە بەریان بە زیادبونیشی نەگرتوە.

ئەو هەموارەی کە پەرلەمانی کوردستان کردی لە یاسادا بۆ ڕێگەگرتن لە فرەژنی، زۆر شتی بە نارونی هێشتەوەو بە ئاشکرا چەند پرس و بابەتێکی یەکلا و دیاریی نەکردوە، ئیتر ئەم کارە بەمەبەست بێت یان لە پێناو زیاد نەکردنی چەند بڕگەیەک بێت. هەموارەکە دەبو کۆمەڵێک شتی دیاری بکردایە، بۆ نمونە: (هەموارەکە بە هیچ شێوەیەک ئاماژە بەوە ناکات کە ئایا پیاوانی نیشتەجێی هەمیشەیی «دائم» هەرێم ئەتوانن لە دادگاکانی باشور گرێبەستی هاوسەرگیری بکەن یان نا؟ هەموارەکە هیچ کات توانا و هێزی ئەوەی نییە کە دادگاکانی سەر بە عێراق جێبەجێی بکەن! هەموارەکە بە هیچ شێوەیەک ناوی گرێبەستی هاوسەرگیری لە بەردەم دادگاکانی عێراق دا نەهێناوە! هەموارەکە بە هیچ شێوەیەک باسی ئەوەی نەکردوە کە ئەو پیاوانەی ژنی دوەم ئەهێنن و ئەو ژنی دوەمە بە رەگەزنامەو بە شوێنی نیشتەجێبون خەڵکی ناوچەکانی باشوری عێراقە، چۆن مامەڵەیان لە گەڵ ئەکرێت؟) ئەمانەو چەندین نمونەی تر کە ئێستا سەریان هەڵداوەو هەموارەکەی هەرێم لە بەردەمیاندا دەستەوەستانە و جێگای ئەو نمونانەی تێدا نابێتەوە.

بۆ تێگەشتن لە چۆنیەتی ئەنجامدانی پرۆسەکە و هەڵوێستی یاسا و دادگا لەم روەوە بە کورتی چوارچێوە یاسایەکانی ئەم پرۆسەیە دەخەمەرو.

سەرەتا ئێمە یاسای لێبوردنی گشتی ژمارە (٢) ی ساڵی (٢٠١٢) مان هەیە، کە سەرۆکایەتی هەرێم دەریکردوەو بە پێی ئەم یاسایە هەرکەسێک ژنی دوەمی تا ئەو بەروارە هێنابێت، ئەوا بێ هیچ سزاو غەرامەیەک پێویستە دادگاکان لێی خۆش بن و هەتا ئەگەر سکاڵاش کرابێت لەو کاتەدا، ئەوا لە کاتی حوکمداندا پێویستە هەمو رێوشوێنە یاسایەکان لە دژی تۆمەتبار رابگیرێت و دۆسیەکەی بە یەکجاری دادەخرێت، بۆ ئەوەش چەندین بڕیاری دادگا هەیە هەرچی دوای ئەو بەروارەیە ئەوا دیسان دادگاکانی هەرێم شتێکی ئەوتۆیان پێ ناکرێت بۆ کەسی قوربانی، چۆن؟

دەبێت ئەوە بزانین کە هێنانی ژنی دوەم و فرەژنی لە چوارچێوەی ئەو تاوانانەیە کە بە تاوانەکانی مافی کەسی دائەنرێن بە پێی یاسای بنەماکانی دادگایی کردنی سزایی «اصول المحاكمات الجنائيه» و بە پێی مادەی (٣)ی یاساکە تەنها ئەو ژنەی کە ژنی بەسەردا هێنراوە دەتوانێت سکاڵا بکات و بەهیچ شێوەیەک داواکاری گشتی و هیچ کەسێکی تر مافی جوڵاندنی سکاڵا و هەواڵ دانیان نییەو ماوەی سکاڵاش تەنها ٣ مانگە، دوای ٣ مانگ ژن ناتوانێت سکاڵا تۆمار بکات. کە لای هەموان رونە سکاڵا تۆمارکردن لە دژی پیاو لە لایەن ژنەکەی خۆیەوە شتێکی تارادەی ئەستەمە و کەم ژن هەیە لە کۆمەڵگای لەم شێوەیەدا بتوانێت لە دژی پیاوەکەی خۆی پەنا بباتە بەر دادگا، بۆ ئەمەش چەندین نمونەی زیندو هەیە کە چەندین ژن گەرچی ناڕازیبون و بە تەواوی بە هۆی ژنی دوەمەوە بونەتە قوربانی، بەڵام نەیانتوانیوە سکاڵا بکەن. دەبو یاسادانەری هەرێم ئەم دۆخەی ژنانی لە بەرچاو بگرتایە و دەشکرێت ئەو مادەیە هەموار بکرێتەوە.

هەروەها ئەگەر گریمانەی ئەوەش بکەین ژن پەنا دەباتە بەر دادگاکان و سکاڵا تۆمار دەکات، یەکەم شت ئەوەیە کە هێنانی ژنی دوەم بە پێی یاسای باری کەسێتی عێراقی پرۆسەیەکی یاساییەو سزا و لێپێچینەوەکانی یاساکەی عێراق زۆر سوکە و شایەنی باسکردن نییە، چونکە ئەو مەرجانەی یاساکە دایناوە هەمو پیاوێک ئەتوانێت لە بەردەم دادوەر بە خۆی رەوا ببینێت و واپیشان بدات کە مەرجەکانی تێدایە، کە سەرەنجام دادوەر گرێبەستەکەی بۆ ئەنجام دەدات. هەڵبەت هەر ئەمەیە وا دەکات پیاوانی دانیشتوی هەرێم پەنا ببەنە بەر دادگاکانی دەرەوەی هەرێم چونکە بە پێی دەستوری عێراقی هەر هاوڵاتیەکی هەرێم بە هاوڵاتی عێراقی دادەنرێت و یاسای باری کەسێتی عێراقی بەسەر هاوڵاتیانی هەرێمیشدا جێبەجێ دەبێت و بەو شێوەیەش لەو دادگایانە پیاوانی دانیشتوی هەرێم دەتوانن سودمەند بن لەو فرەژنییەی کە یاسای عێراقی ڕێگەی پێیداوە.

لە بەر ئەوە هەر کەسێک ژنی دوەم بهێنێت بە پێی یاساو دادگاکانی دەرەوەی ئیدارەی هەرێم ئەوا کارێکی یاسایی کردوەو هیچ لێپرسینەوەیەکی لەگەڵ ناکرێت، بەڵام ئەگەر ژنی یەکەم سکاڵای لە دادگاکانی هەرێم تۆمار کرد بەوەی کە یاسای باری کەسێتی هەرێم لە هەمواری یاسای ژمارە (١٥) ی ساڵی (٢٠٠٨) دا فرەژنی تارادەیەکی زۆر قەدەغە کردوەو تەنها بە چەند مەرجێک نەبێت کە بێگومان مەرجەکان زۆر توندن و لەسەروی هەمویەوە رەزامەندی ژنی یەکەمە، بەڵام بەشی دوەمی هەموارەکە بە تەواوی بوەتە جێگای گفتوگۆ و بە تەواوی لە لایەن بەشێکی زۆری خەڵکەوە رەت دەکرێتەوە، کە سزاکەی دیاری کردوەو دەڵێت: «هەرکەسێک پێچەوانەی مەرجەکانی یاساکە ژنی تری هێنا ئەوا سزا دەدرێت بە حەبس کردن لە نێوان ٦ مانگ بۆ ساڵێک و غەرامەیەکی ١٠ ملیۆنی».

بێگومان ئەگەر هاتو دادگاکانی هەرێم کاریان لەسەر سکاڵای فرەژنی کردو و بڕیاریان دا کە گرێبەستی هاوسەرگیری لە دادگاکانی باشور نایاساییە «کە ئەمەش زۆر زەحمەتە، چونکە جگە لەوەی پێچەوانەی دەستورە و لەبەر ئەوەش کە هەموارەکەی هەرێم بە شێوەیەکی زۆر گشتی و کرچوکاڵ و ناوردبینی کراوە و لە هەمان کاتدا گفتوگۆی زۆری یاسایی هەڵدەگرێت»، دوای ڕێوشوێنیکی زۆر و کاتێکی درێژخایەن ئەگەر هەر دادگایەکی هەرێم سزای کەسی تۆمەتباریدا ئەوا سزاکەی ٦ مانگ زیندانی و بڕێک پارە غەرامەیە، کە بێگومان بە پێی ئەزمونی کارکردنی دادگاکانی لێکۆڵینەوەو کەتن لە دادگاکانی گەرمیان، قۆناغی کۆتایی هاتنی هەر سکاڵایەکی فرەژنی ماوەیەکی زۆر دەخایەنێت کە دەگاتە زیاتر لە ساڵێک، ئەمەش بە هیچ شێوەیەک هیچ سودێکی بۆ قوربانی ناو ئەم سکاڵایانە نابێت.

بە کورتی ئەگەر دادگاکانی هەرێم بڕیاری ئەو سزایەیاندا ئەوا لە پرۆسەیەکی تەواو زەحمەتدا داویانە، چونکە سزادانی کەسێک کە بە پێی یاساو دادگای فەرمی عێراقی گرێبەستی ئەنجامدابێت، پرۆسەیەکی زۆر زەحمەتە و رەنگە لە لایەن یاساو دادگاکانی عێراقەوە بە تەواوی بە نایاسایی دابنرێت، هۆکاری ئەمەش ئەو ئاڵۆزییەی سیستەمی یاسایی و ئیداریی و دەستورییەیە کە لەنێوان هەرێم و عێراق دروست بوە.

ئەمە جگە لەوەی لە بەرپرسیارێتیەکان بە پلەیەکی تر لە ئەستۆی ئەو دادگایانەیە کە ئەو پرۆسانەیان تێدا ئەنجام دەدرێت، بەتایبەتی بەرپرسیارێتی دادگاکانی باشور کە روبەروی ئەو تۆمەتە دەبنەوە هاوکاری فراوانبون و زیادبونی فرەژنی دەکەن یان نا؟ هەروەک بەرپرسیارێتیەکی تریشی لە ئەستۆی دادگاکانی هەرێمە کە ئایا چۆن دەچن بە پیری سکاڵاکانی فرەژنییەوە؟ ئەمە جگەلەوەی سکاڵانەکردنی خودی ژنانیش، هۆکارێکی ترە بۆ ئەوەی کەیسەکانی فرەژنی بەئەنجام نەگەن!

---

# تێڕوانینێکی هەڵە بۆ گەرمیان!



▪ شەرمین عەلی

**هەرکە ناوی گەرمیان دەهێنرێت، زەنیەتی زۆرینەی ئەوانەی خەڵکی دەرەوەی ئەم ناوچەیەن، بۆ لای ژن کوشتن و خەتەنەو توندوتیژی دەچێت.**



کۆمەڵگەی کوردی بە گەرمیانیشەوە، کۆمەڵگەیەکی داخراو، کلتورخواز و نێر سالارە، ئەوەشی بۆتە قوربانیی سەرەکی ئەم ژینگەیە ژنانن، واتە ژنکوژی و توندوتیژی تەنها تایبەت نیە بە یەک ناوچە، باشترین نمونەش بۆ ئەوە بونی دەیان ژنی چالاکی گەرمیانیە، کە لە رابردو ئێستاشدا لەبوارەکانی سیاسی، رۆژنامەنوسی، کاری مەدەنی و کایەی رۆشنبیری و هونەردا، لەسەر ئاستی کوردستان دیار و دەرکەوتو خاوەن رۆڵ و پێگەن، خۆ دواجار ئەم ژنانەش لەهەناوی ئەم ناوچەیەدا گەورە بون و پێگەیشتون، کە زۆرینە وەک ناوچەیەکی ژنکوژ لێی دەڕوانن.

ئامارەکان دەریدەخەن ساڵانە دەیان ژن لە کوردستاندا بە پاساوی بێ بنەماو بەناوی شەرەف پارێزییەوە دەکوژرێن، یاخود ناچار بە خۆکوشتن دەکرێن، ئیتر بۆ دەبێت فۆرمی ژنکوژی و کاری نامرۆڤانە بە باڵای گەرمیان ببڕرێت.

دروستکردنی ئەم جۆرە تێڕوانینەو دیاریکردنی جوگرافیایەکی دیاریکراو وەک شوێنێکی دژە ژن، جگە لە زەقکردنەوەی کلتوری ژنکوژی و رەواجدان پێی، هیچی تری لێ بەرهەم نایەت، دەکرێت لەبری ئەوە کار لەسەر دەستکەوت و سەرکەوتنەکانی ئەو ژنانە بکرێت، کە لەم ناوچەیەدا بون بە سەرمەشق و رچکە شکێن، نەک زەقکردنەوەی حاڵەتە نەخوازراوەکان وەک دیاردەو کلتور.

ئەوەشی ئێستا بە رونی لە گەرمیان دەبینرێت، کلتورو نەریت و بەربەستە باوەکانی بەردەم ژنان، بە هەوڵی خۆیان و کەسانی ئازادیخواز لە کاڵبونەوەدان، زۆر زیاتر لە رابردو ژنان و کچانی گەنج هاتونەتە مەیدانی کارکردن، کەلە زۆر بواردا بون و ئامادەگی ئەوان زیاترە لە پیاو.

# منداڵانی ئۆتیزم لەگەرمیان.. حکومەت پشتی تێکردون و سەنتەری ئەهلی دەیانگرێتەخۆ

▪ نەوژین، ژینۆ عەلی

**(محەمەد) لەسەر مێزی دانیشتنەکە دانیشتبو، یاری بەو یاریانە دەکرد کە لەپێشی دا بو، بەدەم یاریکردنەوە جارجار دەیوت: «ئاو...» کە تاکە وشەیە فێری بوە. ئەو دڵخۆشی بەروخسارییەوە دیار بو، بەدەم بزەیەکەوە یاری ئەکرد و هەندێکجار بەدەستە بچوکەکانی چەپڵەی بۆ هاورێ کچەکەی لێئەدا. ئەو دوانە هەردوکیان نەخۆشی (ئۆتیزم)یان هەبو، لەنێو (سەنتەری ئایدا) بون، کەسەنتەرێکی ئەهلییەو بەم دواییانە بۆ منداڵانی نەخۆشی ئۆتیزم لە گەرمیان کراوەتەوە.**

ئۆتیـــزم کە بەعەرەبی پێـــی دەوترێت «التوحد»، نەخۆشیەکە کە لەمێشکی منداڵ دا دروســـت دەبێـــت و بەهۆیەوە پەیوەندی گرێدان لەگەڵ دەروبەردا گران دەکات، چونکـــە پارچـــە جیاوازەکانی مێشک ناتوانن بەیەکەوە کار بکەن.

دیارترین خاڵی جیاکەرەوەی نەخۆشیەکە ئەوەیە کە کەســـی توشـــبو ناتوانێت پەیوەندیەکی ئاســـایی لەگەڵ دەوروبەر بنیات بنێت و زۆربەی کات گۆشەگیرەو لە دونیای تایبەتی خۆیەتی.

لەسنوری گەرمیان ١٠٦ منداڵی توشبوی نەخۆشـــی ئۆتیزم هەیە، بەڵام بەهۆی ئـــەوەی ئـــەم منداڵانـــە مامەڵەکـــردن لەگەڵیانـــدا تایبەتـــە، بۆیە پێویســـت بە بونی ســـەنتەر و ناوەنـــدی تایبەت دەکات.

لەئێستاشـــدا پاش ئـــەوەی حکومەت نەیتوانـــی هیـــچ بـــۆ توشـــبوانی ئەم نەخۆشـــیە بکات، رێکخـــراوی (ئایدا) کەتایبەتە بە چاودێریی منداڵانی ئۆتیزم، ســـەنتەرێکی تایبەتی لە شـــاری کەلار کردوەتەوەو منداڵانی نەخۆشـــی ئۆتیزم لەخۆ دەگرێت.

> بونی سەنتەرێکی وا یارمەتیدەرە هەم بۆ منداڵان و هەم بۆ خانەوادەی منداڵانی توشبو

ســـەعید کەریم، بەڕێوبەری سەنتەری ئایدا بۆنەخۆشی ئۆتیزم، بۆ (نەوژین) وتی: «من کەمناڵەکەم توشی نەخۆشی ئۆتیزم بو بۆیە بڕیارم دا ســـەنتەرێکی وابکەینـــەوە، چونکە کـــۆژان و ئازاری ئـــەو خێزانانە دەزانم کـــە مناڵەکانیان توشبوی نەخۆشی ئۆتیزمن، بۆیە ئێرە بە باشترین شوێن دەزانم کە مناڵەکان سودمەندبن لێی».

وتیشـــی : «مـــاوەی هەشـــت مانگە ســـەنتەرەکەمان مۆڵەتـــی پێنەدرابو، بەڵام مانگی شوبات بەفەرمی مۆڵەتمان وەرگرتوەو کردمانەوە».

هەندێک لـــە هاوڵاتیان نەخۆشـــەکانی ئۆتیـــزم بە «شـــێت» دەزانـــن، بەڵام بەوتەی ســـەعید کەریم «لەراســـتی دا وانیەو ئەو مندالە ئەگەر چارەســـەری تـــەواوی بـــۆ بکرێت بـــاش دەبێتەوەو تاڕادەیەکی زۆر وەکو مناڵێکی ئاسایی لێدێت».

مامەڵەکردن لەگەڵ منداڵانی توشـــبوی ئۆتیزم، کارێکی ســـەخت و گرانە، هەر ئەمەشە دایکان و باوکان نەتوانن بەشی پێویســـت مامەڵەی تەندروست لەگەڵ مناڵە نەخۆشەکانیان بکەن.

گـــوڵان رەشـــید، دایکـــی مناڵێکـــی توشـــبوی ئۆتیزمە، بۆ (نەوژین) وتی: «تێگەیاندنـــی مناڵەکـــەم زۆر قورس بو، بۆیە پێویســـت بو کە سەنتەرێکی لەمشێوەیە بکرێتەوە».

باسیلەوەشـــکرد کە لـــە چەند رۆژێکی هێنانـــی مناڵەکەی بۆ ئەم ســـەنتەرە، هەســـتی بە بەرەوپێشەوەچونی کردوە «لەوەتـــەی هێناومەتە ئەم ســـەنتەرە هەســـت ئەکەم بەرەوباشـــبون ئەچێت و لەحاڵەتـــی خراپبونـــی جارانـــی تاڕادەیەک باشـــبوە، بونی سەنتەرێکی وا یارمەتیـــدەرە هـــەم منـــاڵان وهەم خانەوادەی منداڵانی توشبو».

دەشتی حەسەن، توێژەری کۆمەڵایەتی و مامۆستای سەنتەری ئایدا بۆ منداڵانی ئۆتیزم، بۆ (نەوژین) وتی: « پێگەیاندن و تێگەیاندنی مناڵەکان تاڕادەیەکی زۆر قورسە، چونکە قســـەناکەن کەئەمەش بۆئێمە زۆر قورس دەبێت».

وتیشی: «مناڵی واهەیە بەمانگێک فێری وشەیەک ئەبێت، هەشمانە بە دو مانگ تا شەش مانگ فێری وشەیەک ئەبێت، ئەمـــەش دەریدەخات کـــە کارەکەمان چەند سەختە»

ئەو سەنتەرە بۆ بەڕێوەبردنی کارەکانی، مانگانـــە بڕێـــک پارە لە کەســـوکاری مناڵەکان وەردەگرێت، ئەگەرچی بەوتەی بەڕێوەبـــەری ســـەنتەرەکە پارەکەش شـــتێکی ئەوتۆ نیەو بـــۆ بەڕێوەبردنی خەرجیەکانی سەنتەرەکەیە.

هـــاوکات دەشـــتی حەســـەن، وەکـــو توێژەرێک ئاماژەی بەوەکرد کە «ئەوان راســـتە موچەیەک وەردەگـــرن، بەڵام ئامانجی ســـەرەکیان هیوا بەخشینە بە دایک و باوکـــی مناڵەکان و فێرکردن و پێگەیاندنی مناڵەکانە».

(گوڵان رەشید)یش، ئاماژەی بەوەکرد کە لێـــرە بڕە پارەیەک ئـــەدەن، بەڵام وەکخۆی وتـــی: «خوازیارین حکومەت هاوکارمان بێت، چونکـــە باری دارایی زۆربەی ئەو خێزانانە خراپە».

بەڵام ئایا حکومەت چی پێدەکرێت؟

دەرون عومـــەر، بەڕێوبـــەری گشـــتی چاودێری و گەشـــەپێدانی کۆمەڵایەتی گەرمیـــان، بـــۆ (نەوژیـــن) وتـــی: «پشـــگیریکردن و هاوکاریکردنی ئەم سەنتەرانە پێویستە، ئێمەش هاوکار و پشتگیریانین».

وتیشی: «ئێســـتە هەوڵدەین لەشاری خانەقین وکفریش ســـەنتەری وا بونی هەبـــێ، چونکە هەندێـــک لەخێزانەکان پارەی کرێ پاس و هاتوچۆکردنیان نیە بۆ ئـــەوەی مناڵەکانیان بهێنن بۆ ئێرە، بۆیە پێویستە لەو ناوچانەش سەنتەری وابکرێتەوە.»

---

# بەربڵاوترین و دیارترین نەخۆشیەکانی ژنان



▪ نەوژین

**جەستەی مرۆڤ بەگشتی توشی چەندین کێشەی تەندروستی و نەخۆشی دەبێتەوە، بەڵام هەندێک لەنەخۆشیی و کێشەکان زیاترن لەوانی تر، بەتایبەتی لەلای ژنان.**

کەوایـــا بابپرســـین: ســـەرچاوەی نەخۆشیەکانی ژنان چین؟ چین زۆرترین و بەربڵاوتریـــن نەخۆشـــی و کێشـــە تەندروســـتیەکانی ژنان؟ چۆن دەکرێت خۆمانی لێ بپارێزین؟

د.رەفقا بوحەبیب، پزیشـــکی پسپۆڕی نەخۆشـــیەکانی ژنـــان و منداڵبـــون و نەشتەرگەریی هاناوبینیی، وەڵامی ئەم پرسیارانە دەداتەوە.

ئـــەو باســـلەوەدەکات کـــە لایەنـــی پزیشکیی ژنان بەگشتی دابەش دەبێت بەســـەر دو کـــەرت دا: دوگیان بون و نەخۆشـــیەکانی ژنان. ئەوەی یەکەمیان قۆناغێکی سروشتییەو هەمو ژنێک یان زۆربەیـــان دەیبینن، بەڵام ئەوەی دوەم کەنەخۆشیەکانە، مەرج نیە هەمو ژنێک توشـــی بێت، بەڵکو ئەگەر ئامادەکاری پێویست و گونجاو بکرێت، ئەوا زۆرینەی ژنان ئەتوانن خۆیانی لێبپارێزن.

ئەو پزیشکە ئاماژە بەوەدەکات کە ژنان بەترسەوە لە سەردانی پزیشک دەڕوانن و تەنها لەکاتی بونی کێشـــەو نەخۆشی دا سەردانی دەکەن، لەکاتێکدا واباشترە بەشێوەیەکی خولیی «دوری» سەردانی پزیشک بکرێت و پشکنینی گشتی ئەنجام بدات، بەتایبەت بۆ دڵنیابون لەنەبونی هیچ جۆرە نەخۆشیی و کێشەو گرێیەک، چونکە زانین و دەستنیشـــانکردنی هەر کێشەو نەخۆشیەک لەکاتێکی زو دا، ئەوا دەرفەتی زو رزگاربونیش زیاتر دەکات، بەپێچەوانەشەوە دواخستن نەخۆشیەکە گەورەتر و سەختتر دەکات.

## هەوکردنەکانی ژنان

هەوکردنەکانی ژنان «التهابات نسائیە» وەک (د.رەفقـــا بوحەبیـــب) ئاماژەی پێدا، دابەش دەبێت بەســـەر دو بەش دا. بەشـــی یەکەم ئەو نەخۆشـــیانەیە کەتوشی بەشی سەرەوەی منداڵدانی ژن دەبێت وەکو (ملی منداڵدان و رێڕەوەکان و هێلکـــەدان)، بەشـــی دوەمیـــش ئەو نەخۆشیانەیە کە توشی بەشی ژێرەوەی منداڵدان دەبێت کە بەهۆی سێ هۆکارەوە ژنان توشی دەبن، کەئەوانیش: (کەڕو، بەکتریا و Trichomonasis ن).

بەگوێرەی کۆمەڵەی گشـــتی ئەمریکی بـــۆ نەخۆشـــیەکانی ژنـــان، هەوکردنە بەکتیرییـــەکان، بەربڵاوتریـــن جـــۆری نەخۆشـــیی و هەورکردنن، کە هاوکات ئاســـانترین جـــۆری هەوکردنیشـــن و هۆکارەکەشی بونی بەکتریایەکە کەخۆی لە بنەڕەتەوە لە منداڵدان دا هەیە، بەڵام بەهۆی گۆڕانکاریەکەوە لە جەستە یان خواردنی هەندێک ئەنتی بایۆتیک، یان کەمبونـــەوەی بەرگری لـــەش و یاخود هەندێکجار رەچاونەکردنی پاکوخاوێنی پێویســـت، بەزویی گەشەدەکەن و زیاد دەکەن و هەوکردنی لێدەکەوێتەوە.

بەڵام بەوتەی (د.رەفقا بوحەبیب)، لە رۆژهەڵاتـــی ناوەڕاســـت دا بەربڵاوترین جـــۆری هەوکردنـــەکان، کەڕوەکانـــن، بەتایبەت لەجـــۆری «Candida».

بەوتـــەی ئەم پزیشـــکە، ئـــەم جۆرە هەوکردنـــە هەمـــو ژنێـــک دەگرێتەوە لەمنداڵی بچوکەوە بۆ ژنانێک پاش نەمانی سوڕی مانگانەشیان، هۆکاری سەرەکی توشبونیش رودانی گۆڕانکاریی هۆرمۆنیە لەجەســـتە، یان خواردنی دەرمانی دژە زیندە «ئەنتی بایۆتیک»ە.

هەرچی جۆری ســـێیەمی هەوکردنەکانە کـــە پێـــی دەوترێـــت «بارازیـــت Trichomonasis»، ئـــەوا بەوتەی (د.رەفقـــا بوحەبیب) دەبێتە هۆی دروســـتبونی سوتانەوەو خوران و دەردانی شلەو دەردراوی رون و لینج.

لەبارەی ئەو نەخۆشیانەشـــی کەتوشی بەشـــی ســـەرەوەی منداڵدان دەبن، ئەو پزیشـــکە رونیدەکاتـــەوە کەهەندێکجار ئەو نەخۆشـــیانە گوازراوەن و لەرێگەی سەرجێیکردن و پەیوەندی سێکسییەوە دروســـت دەبن، هەندێکجاریش بەهۆی هەوکردنی میوزەڕۆوە توش دەبن بەهۆی بەکتریـــای «E-Coli» لەدەرەچەی منداڵـــدان دا، ئەمیـــش لەوردەکارییـــدا هۆکاری لاوەکی و جیاوازی هەیە، وەکو بەکارهێنانی شێوازی خراپ لە شۆردنی ناوچەکە، یاخود گیردانی میز یان بەشی پێویســـت ئاو نەخواردنـــەوە، تەنانەت هەندێکجاریش بەهۆی نەخۆشـــیەکانی گورچیلـــەو بونی بـــەردی گورچیلەوە منداڵدان توشی ئەو نەخۆشیە دەبێت.

## چارەسەر چییە؟

ئـــەو پزیشـــکە باســـلەوەدەکات هەر نەخۆشـــییەو هـــەر نەخۆشـــێکیش تایبەتمەندی خۆیان هەیەو لەکەســـێک بۆ یەکێکی تر دەگۆڕێت، بەڵام بەگشتی هەندێک بنەما هەیە کەبەرەچاوکردنی، باری گرانی ســـەر ژنان ســـوکتر دەبن، لەپێش هەموشـــیانەوە پاکـــو تەمیزی راگرتن و خۆپاراستنن.

لـــەو خاڵانەی کە (د.رەفقا بوحەبیب) پێشـــنیازی دەکات کەوەکو خۆپارێزی پێویستە بگیرێتە بەر، ئەوەیە کەلەکاتی بەکارهێنانی دەرمانەکانی ئەنتی بایۆتیک بۆماوەیەکـــی زۆر لەلایـــەن ژنانـــەوە، ئەوا دەبێت دەرمانێک بۆ پاراســـتن لە هەوکردنیش بەکاربهێنرێت بەمەبەستی لادانی مەترســـی و کاریگەری ئەو دژە زیندانە لەسەر منداڵدانی ژنان. هەروەها راهێنانی کچان هەر لەتەمەنێکی زوەوە بەوەی پێویستە شێوازی خۆپاکراگرتن بەتـــەواوی جێبەجێبکـــەن بەتایبەتی بەشـــێوەیەک بێـــت لەپێشـــەوە بەرەو دواوە خۆیان بشـــۆن و پاک بکەنەوە. هـــەروەک بۆناوچە هەســـتیارەکان نە ســـابونی تیژ بەکاربهێنرێت، نە خاولی و وشککەرەوەی کەسانی دیکە، چونکە مەترســـی گواســـتنەوەی نەخۆشـــی لێدەکرێت، بەڵکو پێویستە هەر کەسەو خاولی و پاککرەوەی تایبەت بە ناوچە هەســـتیارەکانی خـــۆی هەبێـــت و هی کەسی تر بەکارنەهێنێ.

منالآن لە قەفەسی هاوسەرگیریی دا...

# 10 وڵات ڕێگە بە بەشودانی کچانی منالٚ دەدەن



■ نەوژین

**ڕاپۆرتێک کە سەنتەری لێکۆڵینەوەی ئەمریکی دەریکردوە، ئاماژە بە ١٠ وڵاتی عەرەبی دەکات کەبەپێی یاساکانیان، ڕێگە بە بەشودانی کچانی منالٚ لەخوار تەمەنی ١٨ ساڵەوە دەدەن.**

هاوسەرگیریی پێشوەخت، یان زو بەشودانی کچان، پرۆسەیەکە لەزۆرێک لە وڵاتە دواکەوتوەکان دا ئەنجام دەدرێت، ئەمەش کارێکە بەپێی بنەماکانی مافی مرۆڤی جیهانی ڕێگەپێنەدراوە، چونکە مرۆڤ تا دەگاتە تەمەنی ١٨ساڵی، بە منالٚ هەژمار دەکرێت و دەبێت مافە یاسایی و مرۆییەکانی دەستبەر بکرێت و نەخرێتە ژێر بارگرانی هاوسەرگیرییەوە.

لەنێو وڵاتانی جیهان دا، بەدیارییکراویی وڵاتانی عەرەبی، لەپێشەنگی ئەو وڵاتانەن کە کچانی منالٚی تێدا بەشو دەدرێن و هاوسەرگیرییان پێدەکرێت.

بەپێی توێژینەوەکەی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ئەمریکی کە پشتی بەو زانیارییانە بەستوە کە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا کۆیکردونەتەوە، یاسای زۆرینەی وڵاتانی عەرەبی ڕێگە بەم کارە دەدات، ئەگەرچی هەندێکی تریشیان تەمەنی هاوسەرگیرییان بە ١٨ ساڵ بۆ سەرەوە دیاریی کردوە، بەڵام سەرباری ئەوەش لەبارودۆخی تایبەت دا ڕێگە بە شوکردنی کچانی خوار ئەو تەمەنەش دەدەن، ئەمەش هەندێکجار بە پاساویی «قازانجی» کچەکە.

ڕاپۆرتەکە ئاماژە بەوەدەکات، لەو وڵاتانە کە تەمەنی هاوسەرگیری کراوەتە سەروی ١٨ ساڵ، بەڵام لەزۆرێک لە ناوچە دورەدەست و لادێنشینەکان دا، گوێ بەم یاسایانە نادرێت و کچان لە تەمەنێکی منالٚ دا بەشو دەدرێن.

ئەمەش لیستێکە بەناوی ئەو ١٠ وڵاتە عەرەبییەی کە ڕێگە بە هاوسەرگیریی کچانی منالٚ دەدەن:

## 1
بەحرەین

یاساکانی ئەم شانشینە، کەمترین تەمەنی هاوسەرگیریی بۆ کچانی بە ١٥ ساڵ و بۆ کوڕان بە ١٨ ساڵ دیاریی کردوە.

## 2
کوەیت

بەپێی یاساکانی ئەم وڵاتە، کەمترین تەمەنی هاوسەگیری بۆ کچان ١٥ ساڵە، بەڵام بۆ کوڕان ١٧ ساڵە.

## 3
لوبنان

لەم وڵاتەدا یاسا ڕێگەی داوە کچان لەتەمەنی ١٧ ساڵییەوە هاوسەرگیریی بکەن، بەڵام بۆ کوڕان تەمەنەکە ١٨ ساڵە.

## 4
عێراق

کەمترین تەمەنی هاوسەرگیریی بۆ کچان لە کۆماری عێراق ١٥ ساڵە، بەڵام بەومەرجەی ڕەزامەندی دایک و باوکی لەسەر بێت.

## 5
قەتەر

لەم وڵاتە بچوکەدا، کچان لە تەمەنی ١٦ ساڵییەوە بەپێی یاسا، ڕێگەی هاوسەرگیرییان پێدراوە.

## 6
سعودیە

شانشینی سعودیە، هیچ یاسایەکی نییە کە تەمەنی کچانی بۆ هاوسەرگیری دیاریی کردبێت، بەڵکو هەندێک لە زانا ئاینییەکانیان فەتوای ئەوەیان داوە کە کچان لەتەمەنی ١٠ ساڵییەوە دەتوانرێت بەشو بدرێن.

## 7
سۆماڵ

هیچ تەمەنێک بۆ شوکردنی کچان دیاریی نەکراوە. ڕاپۆرتی سەنتەرەکە ئاماژە بەوەدەکات کە ٤٥٪ ژنانی ئەم وڵاتە، لەخوار تەمەنی ١٨ ساڵییەوە هاوسەریگرییان پێکراوە، ٨٪ لەخوار تەمەنی ١٥ ساڵییەوە بەشو دراون.

## 8
سوریا

کەمترین تەمەن بۆ هاوسەرگیریی کچان ١٧ ساڵەو بۆ کوڕانیش ١٨ ساڵ.

## 9
سودان

یاسای ئەم وڵاتە کەمترین تەمەنی کچانی بۆ هاوسەرگیریی، بە ١٠ ساڵ دیاریی کردوە.

## 10
یەمەن

یاسا هیچ بنەمایەکی لەبارەی تەمەنی کچان بۆ هاوسەرگیریی دیاریی نەکردوە، بەڵام بەشودانی کچانی منالٚ دیاردەیەکی زۆر بەربڵاوی ئەم وڵاتەیە، بەشێوەیەک کچان لەتەمەنی ٨ ساڵییەوە بەشو دەدرێن.

سەرچاوە: سایتی ڕادیۆ سەوا

---

# هەمو شتێک لەبارەی گرنگی شیری دایک و سودەکانی



■ نەوژین

**شیری دایک خۆراکی تەواوە بۆ کۆرپەکەی. زیاتر لە ٤٠٠ جۆر ماددەی خۆراکیی تێدایە لەگەڵ هۆرمۆن و پێکهاتەی تر، کە بەرگری دەکەن دژی توشبونی کۆرپە بە نەخۆشی کە لە شیری قوتودا نین.**

**بۆ ماوەی چەند پێویستە شیری دایک بدرێت بە کۆرپە؟**

باشترە کۆرپە، لە ماوەی شەش مانگی یەکەمی تەمەنیدا تەنها شیری دایکی بخوات. دواتریش کە دەستی کرد بە خواردنی خۆراکی ڕۆژانەی کەسانی پێگەشتو، پێویستە شیری دایکیشی بەردەوام بێت هەتاکو کۆتایی ساڵی یەکەمی تەمەنی. بەم شێوەیە بەرگریی لەشی کۆرپەکەت پارێزراوتر دەبێت.

**سودەکانی شیری دایک چین بۆ کۆرپە؟**

* شیری دایک دژە تەنەکانی تێدایە کە بەکتریا و ڤایرۆس لەناودەبەن.
* مەترسیی توشبونی کۆرپە بە نەخۆشیی ڕەبۆ و هەستیاری کەم دەکاتەوە.
* مەترسیی کێشی زیاد کەم دەکاتەوە.
* پەیوەندیی نێوان دایک و کۆرپە بەهێز دەکات.

**سودەکانی شیردانی سروشتی چین بۆ دایکەکە؟**

* لەشی دایکەکە لە کاتی شیردانی سروشتیدا کالۆریی زیاد دەسوتێنێت. بەم شێوەیە هاندەر دەبێت بۆ دابەزاندنی کێشی زیادی دەستکەوتو لە کاتی سکپڕییەکەدا.
* خوێنبەربونی منداڵدان کەم دەکاتەوە دوای منداڵبون.
* مەترسیی توشبونی شێرپەنجەی مەمک و هێلکەدان کەم دەکاتەوە لە دایکەکەدا.

**چۆن بزانم منداڵەکەم بە شیری خۆم تێردەخوات یاخود نەخێر؟**

ئەمانەی خوارەوە چەند نیشانەیەکی وەرگرتنی کۆرپەیە بە خۆراکی تەواو و پێویست:

* مەمکەکان نەرمتر دەبن دوای شیردان، چونکە کۆرپە بەشێکی شیرەکەی خواردۆتەوە.
* دوای شیرپێدانەکە کۆرپە هێواش دەبێتەوە و دەخەوێت.
* کۆرپە کێشی بە شێوەیەی سروشتی زیاد دەکات.
* لە چەند ڕۆژی سەرەتای تەمەنی کۆرپەدا، لەوانەیە یەک یان دو دایبی تەڕبکات، چونکە کۆرپە لە مەمکی دایکیەوە لە جیاتی شیر شلەیەکی زەردی خەست دەخوات پێدەوترێت Colostrum کە زۆر بەسودە و نابێت فڕێ بدرێت. کە شیر لە مەمکەکان دروستبو، کۆرپە ڕۆژانە شەش بۆ هەشت دایبی تەڕ دەکات.
* لە مانگی یەکەمی تەمەنیدا کۆرپە پیسایییەکەی زەردە و ڕۆژانە لانی کەم سێ جار پیسایی دەکات.

**جیاوازییەکانی نێوان شیری دایک و شیری قوتو چین؟**

* مەمکی دایک لە چەند ڕۆژی یەکەمی شیردان دا شلەیەکی زەردی خەست دەردەکات کە زۆر دەوڵەمەندە بە دژەتەنەکان و بەرگریی لەشی کۆرپە دژ بە نەخۆشی بەهێزدەکات. ئەم ماددەیە لە شیری قوتودا نییە.
* ماددەی پرۆتین و چەوری و کاربۆهایدراتی شیری دایک بە ئاسانتر لە کۆئەندامی هەرسی کۆرپەدا هەڵدەمژرێت، هەرچەندە بڕەکانی کەمترە بە بەراورد بە شیری قوتو.

**ئەو خۆراکانەی شیری دایک زیاد و کەم دەکەن؟**

هەندێک خۆراک هەن کە بڕی شیری دایک زیاد دەکەن و هانی شیردان دەدەن وەکو: (شۆفان، ماسیی سەلەمۆن، سپێناخ، گێزەر، برنجی قاوەیی، قەیسی و بادەم).

هەروەک هەندێک خۆراکی دیکەش هەن کە بەپێچەوانەوە شیری دایک کەم دەکەن و دەبێت دایک لێیان دور بکەوێتەوە. ئەوانیش:

١. قاوە و چا، چونکە ماددەی کافیین دەچێتە شیرەکەوە.
٢. پیاز و سیر و خۆراکی تون، چونکە تامی شیر تێک دەدەن.
٣. خوردنەوە کحولییەکان.

ئا: کەرتی تەندروستیی ڕێکخراوی هۆرایزن ڕیلیف

---

# دەربارەی

نەوژین

نەوژین، ڕۆژنامەیەکی سەربەخۆی تایبەتمەندە بە پرسەکانی ژنان، مانگانە لەلایەن ڕادیۆی دەنگ لە گەرمیان بڵاودەکرێتەوە.

ڕادیۆی دەنگ، پرۆژەیەکی میدیایی سەربەخۆیە لە ناوچەی گەرمیان، لە ٢٠١٠ وە بە پەخشی ڕادیۆیەکی لۆکاڵی دەستی پێکردوەو پاشان وێبسایتێکی داناوە.

ڕۆژنامەی نەوژین یەکێکە لە چالاکیەکانی پرۆژەی ڕادیۆی دەنگ بە پاڵپشتی سندوقی نیشتمانی بۆ دیموکراسی (NED) ئەمریکی.

ڕۆژنامەی نەوژین یەکێکە لە چالاکیەکانی پرۆژەیەکی ڕادیۆی دەنگ کە لەلایەن سندوقەکەوە پاڵپشتیی دەکرێت.

ڕۆژنامەنوسانی ئەم ڕۆژنامەیە، ژمارەیەک کچن کەپێشتر خولێکی ڕاهێنانیان لەلایەن ڕادیۆی دەنگەوە بۆئەنجامدراوەو زۆرینەیان پێشتر کاری ڕۆژنامەوانییان نەکردوە.

بۆ پەیوەندیکردن بە ڕۆژنامەکەوە:
تەلەفۆن:
٠٧٤٨٠٢٠٧٤٠٠
ئیمەیڵ:
nawzhinnewspaper@gmail.com
فەیسبوک:
nawzhinnewspaper

دەتوانن لەماڵپەڕی ڕادیۆی دەنگ کۆپی ئیلیکترۆنی ژمارەکانی ڕۆژنامەکە ببینن
www.radiodang.org

# کچێک خانەقین ڕەنگ دەکات







**▪ نەوژین، سۆما جاف**

**تاژان فەخرەدین، کچە شێوەکارێکی دانیشتوی قەزای خانەقینە و لە هەوڵیکدا بۆ جوانی بەخشین بە سیمای شارەکەی لەگەڵ یەکێتی لاوانی دیموکراتی لە کوردستانی عێراق، پرۆژەیەکی بۆ ڕەنگکردنی هەندێک دیواری ئەنجامداوە.**

لە بارەی پرۆژەی جوانکارییەکەیەوە، (تاژان) بۆ (نەوژین) وتی: «پرۆژەی جوانکاری بۆ شوێنە گشتیەکانی خانەقین بە هەماهەنگی لەگەڵ ڕێکخراوی یەکێتی لاوان ئەنجاممدا، هەڵبەت ئەوان خاوەنی بیرۆکەی پرۆژەکە بون و وا ڕێککەوتین کە ئەوان کەرەستە دابین بکەن و من وێنە بکێشم لەسەر ئەو دیوارانەی کە خۆیان دەست نیشانیان دەکرد».

تاژان فەخرەدین، ئەوەشی وت : « کەئەم ئیشەم تەواو کرد بە سوپاسەوە خەڵکی خانەقین ناسنامەی (هونەرمەندی ئەڵوەن)یان پێبەخشیم کە بە راستی ئەو نازناوە بۆ من جێگای شانازیەو هاندەرێکە کە لە داهاتو دا کاری لەوە جوانتر بکەم بۆ شارەکەم».

باسیلەوەشکرد کە دەستی بە کارکردن کردوە لەو پرۆژەیە، خوێندکاری قۆناغی چواری پەیمانگای هونەرەجوانەکان بوەو ئەو بیرۆکەیەی هەر لەخەیاڵدا بوە کە لەسەر دیوار نەخش بکێشێت، بەڵام دواتر (ئەمیر خانەقینی) لەرێگەی یەکێتی لاوانەوە پێشنیازی کرد پێکەوە ئەو پرۆژەیە ئەنجام بدەن.

> خەڵکی خانەقین ناسنامەی (هونەرمەندی ئەڵوەن) یان پێبەخشیم

وتیشی: «لەسەرتاوە (م.سیروان نەورۆز) زۆر یارمەتیدام و پێکەوە ئەو کارەمان دەکرد، بەڵام بەداخەوە دوای چەند رۆژێک باری تەندروستی تێکچو، ئیتر خۆم بە تەنها تەواوم کرد.»

«هونەرمەندی ئەڵوەن» لە درێژەی باسکردنی کارکردنی لەم پرۆژە جوانکارییە ئاماژەی بەوەشدا، ئەم کارە بۆ کچ ئاسان نییە کاتیک کە کچێک لەسەر شەقام وێنەدەکێشێت کەسانێکی زۆر دەبینێت کە توانج دەدەن، بەڵام لەگەڵ ئەوەش کەسانی زۆر دەستخۆشییان لێکردوە و ئەمەش بون بەهاندەری کە کارەکەی بەشێوەیەکی جوان ئەنجام بدات «لەو کەسانەش کە زۆر هاندەرم بون: خانەوادەکەم و بەتایبەتی خوشکەکەم».

تاژان، لەبارەی بەکارهێنانی جۆری کەرەستەو بۆیەکان لە پرۆژە جوانکارییەکەیدا، ئەوەی خستەڕو ئەو شوینانەی کاری تێدا کردون کۆن بون، هەربۆیە پێویستی کردوە هەمو جۆرە بۆیەیەکی تێدابەکاربهێنرێت. وتیشی: «لە دو شوێنی شارەکە من نەخشم کێشاوە یەکێکیان لە بازاڕی سەرای کە وێنەکە بریتی بو لە دیمەنی جوانی لەناوەڕاستی بازاڕی کۆنی شارەکەش کە ئەو بازاڕە بە شوێنێکی مێژوی دادەنرێت لە خانەقین لەسەر چەند دیوارێک نەخشم کێشاوە کە درێژیەکەی لەنێوان ٤ بۆ ٥م دەبێت و بەرزیەکەشی ٣م بو، هەروەها ئەوی تریان لە پلەکانەی نەخوشخانەی هیوایە لەبەر ئەوەی ئەو شوێنە تاکو بڵێت سیمای ئەو ناوچەیەی ناشرین کردبو و ماوەی ئیشکردنیشم لەو پرۆژەیە ١٢ بۆ ١٣ رۆژی خایاند.»

تاژان، باسیلەوەشکرد کە ئەمە یەکەم ئەزمونی ئەو بوە لەکێشانی وێنە لەسەر دیوار «ئەوە یەکەم جارم بو کە وێنە لەسەر دیوار بکێشم، زۆر قورس بو بەلامەوە بەتایبەت کە دەستم بە پرۆژەکە کرد مانگی حوزەیران بو و کەشوهەوا زۆر گەرم بو و هەروەها تاقیکردنەوەشم هەبو، بۆیە ماوەیەک دابڕام، پاشان بۆ دوەمجار دەستم بە کار کردن کردەوە لەبەر ئەوەی باوەڕم بەخۆم هەبو کە دەتوانم ئەو کارە بەجوانترین شێوە ئەنجام بدەم.»

# ژنانی گەرمیان دەبنە مەلەوان

**نەوژین،**
**زریان محەمەد — جوانە جەلیل**

**ژمارەیەکی بەرچاو لە ئافرەتان، لە تەمەن و ئاستی خوێندن و پیشەیی جیاواز، حەوزێکی مەلەکردن کۆیکردبونەوە. ئەوان هەریەکەو لەجێگەو گەڕەکێکی جیاوازەو هاتبون و سەرقاڵی مەلەکردن بون، لەدیمەنێک دا رادەی ئەو بەرەوپێشەوەچونە پیشان دەدات کە ژنانی گەرمیان لە خواست و ئارەزوەکانیاندا بەدییان هێناوە.**

لەئێستادا و رۆژانە، ژمارەیەکی بەرچاو لە ژنانی کەلار، بۆ مەلەکردن رو لە مەلەوانگەی سپۆرت سەنتەر دەکەن، ئەوان خۆشحاڵن بەم هەنگاوەیان و بەڕێوەبەر و سەرپەرشتیارانی مەلەوانگەکەش، باس لە زیادبونی رێژەی سەردانیکەرانیان دەکەن.

بەهار رەحیم، (٣٣) ساڵ، جگە لە پیشەی مامۆستایی، خوێندکاری بەشی وەرزشە لە زانکۆی گەرمیان، باس لەوە دەکات هاتنی بۆ ئەم مەلەوانگەیە بۆ دو هۆکار دەگەڕێتەوە.

رونیکردەوە: «هۆکاری یەکەم: حەزو خولیام بۆ مەلەوانی وایکردوە سەردانی ئێرە بکەم و لە پاڵ ئەمەشدا بیرۆکەی ئەوەم هەیە لە رێگەی ئەم سەنتەرەوە ببم بە راهێنەری مەلەوانی. هۆکاری دوەمیش یەکێک لە وانەکانی زانکۆم وانەی مەلەوانیە بۆیە ئەمە وایکردوە سەردانی ئێرە بکەم.»

وتیشی: «سەرەڕای پیشەی مامۆستایم و سەرقاڵم بە خوێندنەوە، بەڵام حەز و خولیام بۆ فێربونی مەلەوانی وایکردوە کە هەفتەی جارێک سەردانی مەلەوانگەی سپۆرت سەنتەر بکەم».

بەڵام جیاوازتر لە بەهار، روناک ئیبراهیم، (٤٠) ساڵ، بۆ (نەوژین) وتی: «من بەهۆی نەخۆشی فەقەراتەوە بۆ نزیکەی ساڵێکە سەردانی ئێرە دەکەم و سوپاس بۆ خوا سودێکی زۆر باشم لێبینیوە».

وتیشی: «زۆر سوپاسی راهێنەرەکەم دەکەم، کە بە هەمو شێوەیەک هاوکاریمان دەکات و فێرمان دەکات».

> ڕێژەیەکی زۆری ژنان لەتەمەن و پیشە جیاوازەکان دەستیان بە مەلەوانی کردوە

ئەگەرچی کردنەوەی مەلەوانگەی سپۆرت سەنتەری تایبەت بە ئافرەتان لە گەرمیان شتێکی نوێ نییە و نزیکەی (٣) ساڵە کراوەتەوە، بەڵام بە هۆی نەبونی ئاستی وشیاری و زاڵبونی کلتورەوە رێژەی سەردانی کردنی سنوردار بوە، بەڵام بەهار بە پێچەوانەوە رچەشکێنی کردوەو دەستبەرداری حەزو خولیای مەلەوانی نەبوە، وەک خۆی دەڵێت: «زۆر سوپاسی خانەوادەکەم و هاوسەرەکەم دەکەم کە زۆر هاوکارم بون».

مەلەوانگەی سپۆرت سەنتەر، لە بەرواری ٢٠١٤/٥/٢٠ بۆ هەردو بەشی ئافرەتان و پیاوان کراوەتەوە، ئەم مەلەوانگەیە زیاد لە (٢٥) کارمەندو (٤) راهێنەر لەخۆدەگرێت و یەکێک لە راهێنەرەکان ئافرەتەو تایبەتە بە بەشی ئافرەتان، تاوەکو ئێستاش (٤٠) خوێندکاری ئافرەتیان پێگەیاندوە لە بواری مەلەوانیدا.

سیڤان سەروەت، راهێنەری بەشی ئافرەتان لە مەلەوانگەی سپۆرت سەنتەر بۆ (نەوژین) وتی: « بۆ ماوەی (٢) ساڵە راهێنەرم لێرە , فێرکردنی ئەو کەسانەی کە سەردانمان دەکەن کارێکی قورسەو ماندوبونی دەوێت، بەڵام من ئاسودەم لەگەڵ کارەکەم و ئەوانەشی کە راهێنانیان پێدەکەم».

وتیشی: «جگە لەوانەی کە بۆ فێربون و بەهۆی نەخۆشیەوە سەردانم دەکەن، چەند خوێندکارێکی منداڵیشم هەیە کە لە خوار تەمەنی (١٢) ساڵیەوەن، فێرکردنی ئەوان بۆ من ئاسانترو چێژبەخشترە، چونکە ئەوان ناترسن و وزەیەکی زیاتریان هەیە بۆ فێربون».

سیڤان وەک خۆی دەڵێت: «من زۆر ئاسودەم بە کارەکەم و تاوەکو ئێستا هیچ ئاستەنگ و بەربەستێکی وەهام نەهاتوەتە پێش تاوەکو پەشیمانم بکاتەوە لە پیشەکەم، لەگەڵ ئەوەش پاڵپشتی خێزانەکەم هۆکارێکی تری سەرکەوتنمە».

محەمەد ئەحمەد، بەڕێوەبەری مەلەوانگەی سپۆرت سەنتەر، بە (نەوژین)ی راگەیاند: «لەسەرەتای کردنەوەی ئەم سەنتەرە بەشێکی کەمی ئافرەتان سەردانیان دەکردین، ئەوانەشی کە دەهاتن بە هۆی نەخۆشی فەقەراتەوە دەهاتن».

وتیشی: «بەخۆشحاڵییەوە لە ئێستادا رێژەکە زیادی کردوەو لە تەمەن و پیشە جیاوازەکانەوە سەردانمان دەکەن».

ئاماژەی بەوەشدا: «جگە لە شاری کەلار، لە قەزاو ناحیەکانی تری گەرمیانیشەوە سەردانی ئەم مەلەوانگەیە دەکەن.»

